# چەند ڕێڕوونی یەك

## بۆ خوشک و برایانمان لە هەندەران

عەلی باپیر

چاپی یەکەم

٢٠٠٢ز ١٤٢٣ك

www.alibapir.net

١٩ رمضان ١٤٢٣

# چەند ڕێڕوونی یەك

## بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران



عەلی باپیر

چاپی یەکەم

١٤٢٣ك ٢٠٠٢ز

بسم الله الرحمن الرحيم

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ * وَلا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنْسَاهُمْ أَنْفُسَهُمْ أُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) (الحشر:١٨ - ١٩ )

## پێشکەش بێ

١-بەو کەسانەی کە بەبێ بەڵگەو فەتوای شەرعی ملی ڕێی هەندەران ناگرن.

٢-بەو کەسانەی کە ماوەی گەشت و سەفەرو مانەوەیان لە هەندەران وەك هەل و دەرفەتێك بۆ خزمەتی باشتر و کارو چالاکی چاکتر تەماشا دەکەن .

# ئەم نامیلکەیە

الحمد لله و السلام علی رسول الله محمد و آله و من والاه

خوێنەرە بەڕێزەکان ! ئەم نامیلکەیە لە ئەسڵدا وتارێکە لە ڕۆژی (١٤/ذوالقعدة/١٤٢٢) دا بەرانبەر بە (٢٠٠٢/١/٢٧) لە لایەن بەندەوە دراوەو بەتایبەت ئاراستەی ئەو براو خوشکە موسوڵمانانەمان کراوە کە بە هەر هۆیەك بووە ڕێیان کەوتۆتە وڵاتانی دەرەوە بە تایبەت ڕۆژئاوا (ئەورووپا و ئەمەریکا )، وە وەك دە (١٠) ڕێنوێنی و ئامۆژگاری دڵسۆزانە ئاراستەیان کراوە، پاشان برای بەڕێزم کاك ( مەلا بلال قەڵادزەیی ) لە کاسێتەوە هێناویەتە سەر قاقەزو، دوایش بۆ خۆم دووبارە پێیداچوومەوەو لە هەر جێیەك بە پێویستم زانی دەسکاری هەندێك وشەو تەعبیریم کرد.

خوا پاداشتی کاك مەلا بلال بداتەوەو ئەم نامیلکەیەش ببێتە مایەی بەهرەو سوود لێ وەرگرتنی خوشك و برایانی مسوڵمان لە دەرەوە و نێوخۆی کوردستانیش دا.

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين و الصلاة و السلام على المبعوث رحمة للعالمين محمد و اله و صحبه اجمعين و من اهتدى بهديه و سار بسيرته باحسان الى يوم الدين .

براو خوشکە بەڕێزەکانی هەندەران ، ئەو براو خوشکە بەڕێزو خۆشەویستانەمان کە بەتايبەت لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا نيشتەجێن جا چ بە شێوەی کاتی چووبن چ بە يەکجاری لەوێ سەقامگير بووبن ، پاش سەلام و ڕێز پێ ڕاگەياندنتان لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە ئێوەش و ئێمەش و هەموو لايەك تەوفيق و هيدايەت بدات کە ئەو پێنج و دوو ڕۆژەی ژيانی دونيا بە شێوەيەك بەسەر بەرين و بگوزەرێنين کە لە دونيادا پێ‌ی سەر بەرز بين وە لە دوا ڕۆژيشدا شايستەی ئەوە بين کە بەرەزامەندی خواو بەهەشتی بەرين شاد بين.

بەڕێزان ! بێ گومان ژيانی دونيا تاقيگەيە وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾ (الملك:٢) واتە: ئەو زاتەی کە ژيان و و مردنی ڕەخساندوون تاکو تاقيتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی باشترە .

يان وەك دەفەرموێ : ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾ (الكهف: ٧) ، واتە: ئێمە ئەوەی کە لە سەر زەويدايە ڕازاندومانەتەوە تاکو تاقی‌يان بکەينەوە کاميان کردەوەی باشترە .

کە بێگومان مەبەست لە کردەوە ( عمل ) هەم کردەوەی دڵ دەگرێتەوە کە بريتی‌يە لە نيەت و نيازو مەبەست و خۆشويستنی پەروەردگارو پشت بە خوا بەستن و هتد.. ئەو کردەوانەی کە پێيان دەگوترێ ( اعمال القلوب )، وە هەم دەربرين (تعبير)ەکانی زمان دەگرێتەوە ، هەم کردەوەی ئەندامەکانيش

دەگرێتــەوە، بــەڵێ وشـــەی ( عمــل ) لـــە زاراوو بـــەکارهێنانی شـــەرعدا هـــەموو چالاکی‌یـــە دەروونـــی و دەربڕینـــی و جەســـتەیی و ڕواڵەتی‌یـــەکانی ئینسان دەگرێتەوە .

کەواتە ئینسان بۆیە دروست بووە و لە سەر زەوی دانراوە تاکو تاقی بکرێتـەوە ، وە مـەیدانی پێشبڕکەو تـاقی کردنـەوەش مـەیدانی کردەوەیـە، چ کردەوەی عەقڵ (دڵ) [1] چ زمان چ ئەندامە ڕواڵەتیەکان .

جا بۆ ئەوەی کە خوای پەروەردگار زیاتر بە شایستەی ئەوەمان بزانێت تەوفیق و هیدایەتی خۆی بە ئێمە ببەخشێت تا ژیانی دونیامان بە شێوەیەکی سـەربەرزانە و ڕوو سـوورانە بگوزەرەێنـین ، وە سـەرەنجام ڕەزامـەندی خـواو پاداشـتی نـەبڕاوەی خـوا کـە بەهەشـتی ڕازاوەو نەبڕاوەیـە وەدەسـت بێنـین ، بێگومان پێویستی‌مان بە ئامۆژگاری و ئاراستەکردن و بەرچاو ڕوونی هەیە.

منیش وەك دڵسۆزێکی خۆتان بە باش و بە پێویستم زانی کە ( ١٠ ) دە خاڵتان ئاراستە بکەم وەك ( ١٠ ) دە ئامۆژگاری و بەرچاوڕوونی، دیارە تەنیا هەر ئێوەش ( ئەو براو خوشکانەمان کە لە هەندەران نیشتەجێن ) ناگرێتـەوە ، بـەڵکو هـەندێکیان گشتین بـەڵام مـن بەتایبـەت ئاراسـتەی ئێوەیـان دەکـەم، مەبەستیشم لە ئێوە براو خوشکانمان کە سەر بە (کۆمـەڵی ئیسلامی)ن، چ وەك ئەندام وەك دۆست و لایـەنگر، وە هـەروەها هەرخوشك و برایـەکی دیکـەی مسوڵمان کە ئەو ئامۆژگاری و ڕێنمونی‌یانەی کە ئێمە ئاڕاستەیان دەکـەین دەکەوێتە بەر چاو و گوێیان .

---

[1] وشەی ( قلب ) لە قورئانێدا وێڕای ( دڵ ) وەك مەڵبەندی هەست و نەستە دەروونی‌یەکان عەقڵیش دەگرێتەوە کە مەڵبەندی بیرو بۆچون و لێکدانەوەکانە.

## یەكەم: هۆكارەكانی ڕوو لە هەندەران كردن

## لە ڕوانگەی شەرعەوە.

ئەسڵ لەنیشتەجێ بوونی مسوڵمان و سەقامگیربوونی‌دا ئەوەیە كە دەبێ مسوڵمان لە نێو مسوڵمانانداو لە وڵاتی مسوڵماناندا و لە نێو میللەتی مسوڵماندا نیشتەجێ و سەقامگیر بێت و ژیان بەسەربەرێ و بگوزەرێنێ.

لەو بارەوە هەم لە ئایەتەكانی قورئان دا هەم لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەردا(ﷺ ) زۆر بە ڕوونی و ڕاشكاوی ئامۆژگاری مسوڵمانان كراوە و ئەو حەقیقەتەیان خراوەتە بەرچاو كە دەبێ مسوڵمان لە نێو موسوڵماناندا بێت و لە ژێر سایەو وڵاتی مسوڵمانان دا بێت، خوای پەروەردگار لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيراً * إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلا يَهْتَدُونَ سَبِيلاً * فَأُولَئِكَ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوّاً غَفُوراً﴾(النساء: ٩٧-٩٩)

واتە: ئەو كەسانەی كە فریشتەكان گیانیان كێشان لە حاڵێكدا كە ستەمیان لە خۆیان كردبوو، پێیان گوتن: ئەوە چیتان بوو بە بێ دەسەڵاتی لە نێو ئەهلی كوفردا مابونەوە؟ گوتیان: ئێمە لە سەر زەوی بێ دەسەڵات كرابووین! فریشتەكان پێیان گوتن: ئەدی سەرزەمینی خوا فراوان نەبوو كە كۆچی تێدا بكەن؟ جا ئەوانە سەرەنجامیان دۆزەخەو ئەوێش خراپترین سەرئەنجامە، بێجگە لە پیاوان و ئافرەتان و منداڵانێكی بێ دەسەڵاتكراو كە هیچ چارەیەكیان لە توانادا نی‌یە و هیچ دەرەتانێكیان نی‌یە ئا ئەوانە ڕەنگە خوا لێیان خۆش بێت بێگومان خوا لێخۆشبوو و لێبوردەیە.

لەم سێ ئایەتەدا خوای پەروەردگار بۆمان ڕوون دەكاتەوە كە كەسانێك توانای كۆچ (هجرة) یان هەبێت بەڵام بە هەڵبژاردن و ئیختیاری خۆیان لە

شوێنێك دا دابنیشن كه دەسەڵاتی كوفری بەسەردایە و كافرستانە و ناتوانن وەك پێویست دینداری خۆیان بكەن ، ئەوە گوناهبارن وە فریشتەكان سەرزەنشتیان دەكەن لە كاتی گیان كێشان دا ، پاشان خوای گەورە هەندێك كەس لەو حوكمە هەڵداوێرێ و جیایان دەكاتەوە، دەفەرموێ: كەسانێك كە لەبەر بێ دەسەڵاتی و لەبەر پێ نەكران و دەسەپاچەیی چ پیاو بن چ ئافرەت بن چ منداڵ بن ئەوانەی كە هیچ دەرەتان و دەرفەتێكیان نیە بۆ خۆ دەرباز كردن ، ئەوانە ڕەنگەو نزیكە خوا لێیان ببورێ ، چونكە هیچ دەرەتان و دەستەڵاتێكیان نیە كە خۆیان لەو واقیعە دەربازبكەن[٢] .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەكی دا دەفەرموێ: (أنا بَرِئٌ مِنْ كُلِّ مُسلم يُقيمُ بَيْنَ أظْهُرِ المُشركينَ قالوا: يا رسولَ الله وَلِمَ؟ قالَ: لا تتراءَى ناراهُما) رواه أبوداود و النسائي و الترمذي و صححه الألباني في ارواء الغليل. واتە: من لە هەر مسوڵمانێك بەریم و حاشای لێ‌دەكەم كە لە نێو هاوبەش پەیداكەراندا نیشتەجێ دەبێ‌و لە نێوانیاندا دەژی، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی؟ فەرمووی: نابێ ئاگرەكانیان لە یەكەوە دیاربن ) ، واتە: نابێ موسلمان و كافر لەیەكەوە نزیك بن مادام مسوڵمانەكە بێ دەسەڵات بێت و توانای دینداری و مسوڵمانەتی ئاشكراو بێ منەتانەی نەبێ .

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (من جامع المشرك و سكن معه فانه مثله) (رواه ابو داود و حسنه الألباني)

واتە: هەركەسێك لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەراندا كۆبێتەوە لە شوێنێك لەگەڵی نیشتەجێ بێت، ئەوە وەك وی وایە.

---

[٢] دیارە وەك زانایان گوتویانە ( عسى من الله واجبة لأن الكريم اذا أطمع أعطى ) واتە: هەركاتێك خوای بەخشەر وشەی ڕەنگە و لەوانەیە ( عسى و لعل ) ی بەكارهێنا لە فەرمایشتی خۆی دا دەربارەی مەسەلەیەك ئەوە مسۆگەر ئەو شتە دەكات و دەبەخشێ چونكە بابای بەخشندە عادەتی وایە ئەگەر ئومێد و هیوای پێشاندا دەبەخشێ ! دیارە بەخشندەیی خواش بێ سنوورە.

چا براو خوشکانی بەڕێزو خۆشەویستم!
لێرەدا پێویستە چەند ڕاستی یەك بزانین:
یەکەم: وەك پێشتر گوتمان ئەسڵ لە نیشتەجێ بوونی مسوڵمان دا ئەوەیە کە لە ژێر سایەی دەسەلاتێکی ئیسلامی و لە نێو خەڵکێکی مسوڵمان دا بێت، کە پێشتر چەند دەقێکمان بە بەڵگە هێنانەوەو پێویست ناکات دوبارەیان بکەینەوە.
دووەم: بەلام دیسان لە ئەسڵیشدا ڕەوا (مباح)یەکە مسوڵمان لەهەر بستە خاکێکی سەرزەمینی خوادا تبارك و تعالى ژیان بەرێتە سەر و سەقامگیر ببێ و چەندان ئایەتی قورئان ئەو ڕاستی یە دەگەیەنن بۆ وێنە:
﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾ (الملك:١٥)
﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ﴾ (العنكبوت:٢٠)
﴿ وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴾ (الرحمن:١٠)
بەلام شتێکی ئاشکرایە کە ئەو ڕەوا ( مباح ) بوونەی تێدا هاتن و چوونی تێکرای سەرزەمین و تێدا نیشتەجێ بوونە ، مەرجدار ( مشروط ) و بەنندار (مقید ) کراوە بەوەوە کە ئەگەر ئەو سەرزەمینەی سەفەری بۆ دەکرێ و سەقامی تێدا دەگیرێ ، لە ژێر ڕکێفی حوکمی ئیسلام دا نەبوو، لانی کەم دەبێ بابای مسوڵمان بۆ دینداری و مسوڵمانەتی شەخسی و تایبەتی خۆی تێیدا ئازاد و سەربەست بێت ، ئەگەر نا دروست نیەو ئەو حاڵەتەی ڕەوا بوون (الأباحــة )ە کە ئەسڵە، بەهۆی ئەو گۆڕان ( تغیر )ە کە بەسەر سەرزەمینەکەدا هاتووە کە بریتیە لە ڕێ نەدران بەمسوڵمانەتی تێدا کردنی دەگۆڕێ بۆ قەدەغە ( حرام ) ، ئەوەش بە دەقی ڕوون و ڕاشکاوی سوونەت کە پێشتر ئاماژەمان پێیان کرد .
سێیەم: هەروەها لەو حاڵەتانەش کە بابای مسوڵمان بە هۆی ئازادبوون و ڕێ پێدانی بە ئەنجامدانی دروشمەکانی ئیسلام و ئەرك و طاعة و ڕەوشتو

ئەدەبە شەخسیەكانەوە ، سەفەرو هاتووچۆو نیشتەجێ بوونی سەرزەمینی كافرانی بەڕەوا (مباح)یی بۆ دەمێنێتەوە .بە ئەندازەی ئەوە كە ئەگەری زەرەر مەندبوونی خۆی و خێزانی لە ڕووی عەقیدەیی و طاعەت و ڕەوشت و عادەت و هەڵسوكەوتەوە بۆ پەیدا دەبێت، ئەگەر لە ئێستاش دا نەبێ لە داهاتوودا، ئەوە دیسان كەم و زۆر حوكمی ئەو سەفەر و هاتن و چوون و نیشتەجێ بوونە لە وڵاتی كافرستان دا گۆڕانی بەسەردا دێت لە ناپەسەندی ( الكراهیة )یەوە هەتا قەدەغەبوون( الحُرمة )!

ئەویش لە سەر بناغەی دوو بنچینەی شەرعی ( قاعدتین شرعیتین ) كە ئەمانەن:

یەك: ﴿ كل ما یَجُرُ الحرامَ فهو حرامٌ ﴾ یان (الوسیلة الی الحرام محرمة) هەر شتێك سەربكێشێ بۆ قەدەغەیەك ئەویش قەدەغەیە جا زانایانی ئیسلام بنەمای (سد الذریعة)یان لە سەر ئەم بنچینە شەرعیە بنیات ناوە و هەمووشیان لە سەر ئەوە ڕێككەوتوون كە هەر شتێك بە حەتمی و مسۆگەری بێتە مایەی پەیدابوونی شتێكی حەرام ئەویش حەرام دەبێ با لە ئەسڵدا موباحیش بێت : بۆ وێنە :

هەڵقەندنی بیرو چاڵێك لە سەر ڕێی مسوڵمانان ، یان خەوتن لە پێش نوێژێكدا كە خەریكە كاتی بەسەربچێ، یان خواردنەوەی ئاوێكی زۆر كە تووشی نەخۆشی دەكات، یان فرۆشتنی چەك لە كاتی ئاژاوەو ناكۆكی نێوخۆدا.

دوو: ( درءُ المفاسد مُقدم علی جَلْبِ المصالح ) لابردنی زیانەكان دەخرێتە پێش دابین كردنی بەرژەوەندیەكان .

دیارە بە پێی ئەم بنچینەیەش هەركاتێك شتێك وێڕای قازانج و بەرژەوەندی زەرەو زیانیشی تێدابوو ئەوە پێویستە بەر لەوەی سەرنجی خێرو قازانجەكەی و چۆنیەتی وەدەست هێنانی بدرێ تەماشای زەرەرو زیانەكەی و چۆنیەتی دوورخستنەوەی بدرێ ئەگەر بە هۆی چاوپۆشی لێ كردن و گوێ پێ نەدانی قازانج و سودەكەشی‌یەوە بێت .

کەواتە: هەر کاتێك دڵنیاو مسۆگەر بووین لەوە کە زەرەرو زیان و نەگبەتی‌یەکانی سەفەرو سەردان بۆ کردن و تێدا نیشتەجێ بوونی وڵاتانی کافرەستان پترە لە قازانج و بەرژەوەندیەکانی ئەوە پێویستە بێ سێ و دوو بڕیاری قەدەغەیی بەسەردا بدەین ، بۆ ئەوەی لە سەری قەرزدار نەبینەوەو قازانجمان سەری مایە نەخوات !

## پوختەی قسان :

چوون و سەفەرکردن و نیشتەجێ بوونی مسوڵمان لەوڵاتی کافران دا بە مەرجێك دەرفەت و بواری دینداری و طاعەتی شەخصی خۆی هەبێت وەك گەلێك مەسەلەی دیکە، پێنج حوکمە شەرعیەکانی ( الأباحة، الندب، الوجوب، الكراهية، الحرمة )ی بەسەردا دەچەسپن و ناگونجێ بە موتڵەقی بڵێین: تەنها حوکمێکی هەیە و حەڵاڵە یان حەرام!

چونکە بە پێی بنچینەی ( ما لایتم الواجب إلاّ به فهو واجبٌ) ئەگەر ئەو مەبەستەی بۆی بەسەفەر دەچێ ، یان بۆی نیشتەجێ دەبێ ، سوننەت بێ ؛ سەفەر و نیشتەجێ بوونەکەیش دەبێتە سوننەت و ئەگەر فەرزیش بێت دەبێتە فەرز ، هەروەها بە پێی بنچینەی : (الوسيلة الى الحرام حرامٌ) یان (مایجُر الحرام فهو حرام) یش ، ئەگەر مەبەستەکە ناپەسەند ( مکروه ) و قەدەغە ( حرام ) بێت ، سەفەرو نیشتەجێبونەکەش هەمان حوکم وەردەگرێ و ئەگەر هیچ کام لەو چوار حوکمانەیش نەیگرنەوە ئەوە لەسەر ئەسڵی خۆی کە(إباحة)یە دەمێنێتەوە[٢] بەڵام وەك پێشتریش گوتمان بە مەرجێك لە ئەگەری شوێنەواری بەدو زەرەرمەندیەکی وا کە لە سەری قەرزداربێتەوە سەلامەت و پارێزراو بێت.

---

[٢] زانایانی ئیسلام لەو بارەوە بنچینەیەکی شەرعی‌یان داناوە کە دەڵێ: ( للوسائل حكم مقاصدها ) واتە: وەسیلەو هۆکارەکانیش هەمان حوکمی مەبەستەکانی خۆیانیان هەیە واتە مەبەست و ئامانجەکان چ جۆرە حوکمێکی شەرعی بیانگرێتەوە هەمان حوکم بەسەر وەسیلەو هۆکارەکانیشیان دا دەچەسپێ .

جا خوشك و برا مسوڵمانه بەڕێزەكانی هەندەرانمان !

ئێستا لەم بڕە توێژینەوەیە كە لەبارەی : ( هۆكارەكانی ڕوو لە هەندەران كردن ) ەوە كردمان دەگەینە دوو ئەنجامی گرنگ:

ئەنجامی یەكەم: لە بارەی سەفەر و كۆچكردن بۆ وڵاتانی كافرەستان ، هەم هەڵەیە كە بە موتڵەقی بەڕەوا دابنرێ و هەم قەدەغەكردنی بە موتڵەقیشی هەر هەڵەیە، چونكە ئەو كەسەی كە بە موتڵەقی بەقەدەغەی دادەنێ ئەوە شتێكی ڕەوا ( مباح ) لە خەڵكی حەرام دەكات و ئەویش هەڵەو تاوانە ، چونكە خوای دادگەر فەرمویەتی: ﴿وَلَا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ، هَذَا حَلَالٌ وَهَذَا حَرَامٌ لِتَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ﴾ (النحل: ١١٧) واتە: وە بە درۆ و وەسفی زمانتان هەر لە خۆتانەوە مەڵێن : ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە . تا سەرەنجام درۆ بەناوی ئایینی خواوە هەڵبەستن ..

هەروەها كەسێكیش كە بە موتڵەقی بە ڕەوای دەزانێ و پەنا بۆ بنچینەیەكی شەرعی وەك: ( الضرورات تُبیح المحظورات – ناچاریەكان حەرام موباح دەكەن ) دەبەن، دیسان بە هەڵەدا چوونە چونكە نە هەموو پێویستی و ناچاری ( ضرورة )یێك ڕەوایە قەدەغەی بۆ بشكێنرێ و ، نە هەموو قەدەغەیەكیش دروستە لە كاتی ناچاریدا بەڕەوا دابنرێ، بەڵكو وەك زانایان گوتویانە : ( الضرورات تقدر بقدرها ) واتە: پێویستییەكان بە ئەندازەی پەك لە سەركەوتن دیاری دەكرێن. دیسان ناگونجێ بۆ هەر جۆرە پێویستی و سەر تێوەستانێكیش هەر جۆرە قەدەغەیەك بشكێنرێ چونكە ئەگەر ئەو دەرگایە ئاوا بە ڕەهایی بكرێتەوە سنوورەكان هەموویان پێشێل دەكرێن و دەبەزێنرێن و سەرەنجام هەندێك كەس هیچ قەدەغەیەك نامێنێ كە بە بیانوو و پاساوی جۆراو جۆر نەیان شكێنێ ! بۆیە پێویستە بگوترێ: (لا یباحُ كل محرمٍ لكل ضرورةٍ) هەموو قەدەغەیەك بۆ هەر ناچاریەك موباح نابێت.

بۆیە هەڵوێستی ڕاست و دروست و شەرعی لەو بارەیەوە ئەوەیە کە وەك خستمانە ڕوو: هەموو حاڵەت و مەسەلەکان جوان جوان شی بکرێنەوە و ڕوون بکرێنەوە و لە یەك جیا بکرێنەوە و لە بەر ڕۆشنایی دەقە شەرعیەکان و بنچینە شەرعیەکان دا تەماشا بکرێن و هەڵبسەنگێنرێن ئەوجار بڕیاری گونجاو و پڕ بە پێست و دوور لە تێپەڕاندن و ( إفراط ) و بەزایەدان (تفریط)یان لە بارەیەوە بدرێ!

ئەنجامی دووەم: هەر کەسێك بیەوێ سەفەر و کۆچ و بکات بۆ ئەو وڵاتانە جا بە هەر شێوەیەك بێت و بۆ هەر کارو مەبەستێك بێت ، وە گوناهبار نەبێ، دەبێ پرس و ڕاوێژ بە زاناو شارەزایان بکات و ڕاستگۆیانە و واقیعیانە حاڵەت و وەزعی خۆی بخاتە ڕوو ، ئینجا ئەگەر فەتواو بڕیاری سەفەرکردنی بۆ درا بچێ ئەگەر نا نەچێ، نەك هەر لە خۆوە و بە بێ پرس و ڕاوێژی شەرعزانان ملی ڕێگای هەندەران و وڵاتانی کافرەستان بگرێ و بۆ خوی ببێتە موفتی خۆی ، یان بابایەکی نەزان و نەشارەزا بکاتە موفتی ، یان لە سەر بناغەی چاولێکردن و لاساکردنەوەی کوێرانە !

چونکە لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا گیرۆدەی هەڵە و پەڵەو گوناهباری دەبێت و وەك ڕوونیشمان کردەوە سەفەرکردن بۆ وڵاتانی دەرەوە کە هەم زۆربەی خەڵك و دانیشتوانیان کافرو بێدینن و هەم حوکمو سیستەمی بەڕیوەچوونیان طاغوتیانەو نەفامیانەن ، مەسەلەیەکی سادەو ساکار نیە کە هەر کەسێك ڕاست بوەوە بتوانێ حوکم و بڕیاری ڕاست و دروستی شەرعی لە بارەوە بخاتە ڕوو ، بەڵکو مەسەلەیەکی ئاڵۆزەو پێویستی بە ووردەکاری و بەرچاوڕوونی تەواو هەیە ، کە لە لای زاناو شارەزایانی پسپۆڕ نەبێ چنگ ناکەوێ و خوای پەروەردەگاریش فەرمویەتی: ( فاسألوا أهل الذكر إن كنتم لا تعلمون )( النمل ٤٣ )

هەروەها فەرمویەتی: ﴿ وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لَاتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ (النساء:٨٣)

ئاشکراشە کە ئەو لێکۆڵینەوە و وردەکارییانە تەنها لە بارەی سەفەرکردنی‌کەسانێکەوە پێویستن کە بۆ مەبەست و کارێکی فەرزو سوننەت وەك بانگەواز کردنی خەڵك بۆئیسلام یان وەرگرتنی زانستێکی فەرز کەلەو شوێنە نەبێ چنگ ناکەوێ، یان هەر جۆرە کارو چالاکی‌یەکی دیکەی شەرعی پێویست و پەسەند، یان لانی کەم ڕەوا (مباح) وەك بازرگانی حەڵاڵ وچارەسەری نەخۆشی‌و گەشت و گەڕان، دەچنە ئەو وڵاتانە، جا چ بەشێوەی کاتی (بصورةمؤقتە) و چ بەشێوەی یەکجاری ( بصورة دائمة )، بەڵام کەسانێك کە هەر لە ڕێوە بۆ مەبەست و ئامانجێکی خراپ و پیس و حەرام بۆ وێنە : ڕابواردن و مەیخۆری و داوێن پیسی ، بەسەفەر دەچن، ئەوە هیچ پێویست بە لێوربوودنەوەو لێکۆڵینەوە ناکات بۆ زانینی هەڵوێست و حوکمی شەرع و هەر لە سەرەتاوە ئەو جۆرە سەفەرانە ناشەرعی و حەرامن ، چونکە وەك پێشتر گوتمان : ( الوسيلة الى الحرام محرمة ) وە ( للوسائل حكم المقاصد ) ئیدی مادام ئەو کەسە بۆ ئامانج و مەبەستێکی حەرام و پیس ئەو گەشت و سەفەرەی دەکات ، دیارە سەفەرەکەی هۆکارو وەسیلەی هێنانەدی ئامانج و مەبەستە خراپ و حەرامەکەیەتی و کەواتە هەمان حوکمی ئەویشی هەیە[٣]

---

(٣) بۆ نووسینی ئەو باسە تا ڕادەیەك سوودم لە کتێبی ( قضايا فقهية معاصرة )ی د. محمد سعيد رمضان البوطي ، فصل ( الأقامة و التجنس في دار الكفر ) ص ١٨١ تا ٢٠٤ ، وەرگرتووە شایەنی باسە کتێبی ناوبراو باسێکی کورت و پوختیشی لە بارەی ( ژن هێنان ) لە ئەهلی کیتاب و خواردنی خۆراکیان و سەربڕاویان کردووە ، بڕوانە ص ٢٠٤ تا ٢١٤ کە بێگومان بە چەند مەرجێکەوە هەردووکیان ڕەواو حەڵاڵن .

**دووەم: مسوڵمان بەهەرشێوەیەك و بۆ هەر مەبەستێك چووبێتە ئەو وڵاتانە هەر پێویستە ئەرکە شەرعی‌یەکانی خۆی جێ‌بەجێ بکات..**

بابای مسوڵمان چ بەهۆکارو پاساوێکی ڕەواو شەرعی بچێ بۆ وڵاتانی نامسوڵمان وەك: بانگەوازو خەڵك تێگەیاندن لەئیسلام، وەرگرتنی زانست، چارەسەری نەخۆشی، مامەڵەو بازرگانی، گەشت‌وگەڕان، وە چ بەبێ بەڵگەو پاساوی شەرعی بچێ، وەك ئەوەی کەهەر لەخۆیەوەو بەبێ ئامانجێکی دیار سەری خۆی هەڵگرتبێ، یان بۆ هێنانەدی ئامانج و مەبەستێکی ناڕەواو ناشەرعی و پیس چووبێت، جا چ بەشێوەی کاتیی یان بەیەکجاریی لەوێ سەقامگیرو نیشتەجێ بووبێت، واتە هەر لەسەرەتاوە بناغەی سەفەرو چوونەکەی لەسەر زبڵی خراپ و ناشەرعی بنیات نابێت وەك هەندێك کەس کە بەحیساب بۆ ڕابواردن و خراپەو گوناح و بەدفەڕی دەچێ ! بەڵام لەوێ خوا هیدایەتی دەدات و لە گەڵ خوادا ئاشت دەبێتەوە ! بەڵێ جا مسوڵمان چ بە هۆکارێکی شەرعی و بە بەڵگە و پاساوێکی شەرعی‌یەوە بچێ بۆ وڵاتی کافرەستان و چ بە بێ بەڵگەو پاساوی شەرعی چووبێت واتە چ بە شێوەیەك چوبێت کە گوناهباربێت و چ بە شێوەیەك چووبێت کە گوناهبار نەبێت ، کاتێك لەوێ نیشتەجێ دەبێت و لەوێ بوونەکەی دەبێتە ئەمری واقیع ئەوە ئەو مسوڵمانە تا دەگەڕێتەوە یاخود تا دەرفەتی بۆ دەڕەخسێت و هەلومەرجی بۆ لەبار دەبێت کە لەوێ خۆی دەرباز بکات و بگەڕێتەوە یان کارەکەی ئەنجام بدات و بگەڕێتەوە ، ئەوە پێویستە ئەرکی بەندایەتی خۆی ئەنجام بدات و پێویستە مسوڵمانەتی‌و دینداری خۆی بە پێی توانا بکات ، وە باشترین سوود و بەهرە وەربگرێ لەو نیشتەجێ بوونەی کە لە وڵاتی کوفردا دەیبێت، بۆ وێنە دەتوانێ لەوێ فێری زمان بێت ، فێربوونی زمان زانستێکە ئەگەر بە نییەتێکی باشەوە بێت بۆی بە عیبادەت لە قەڵەم دەدرێت ، وە دەتوانێ فێری زانستێك بێت کە لەوێ هەیە ڕەنگە لە وڵاتی خۆی‌دا نەبێت، وە دەتوانێ فێری کارو پیشە (مهنة)یەکی

حەلاڵ بێت وە دەتوانێ خەڵك بانگ بکات بۆ ئیسلام و فێری دینداریيان بکات واتە خەریکی پەروەردەو فێرکردن بێت و بانگەواز بکات .

**بەکورتی** : نابێ بڵێ مادام کاتی خۆی بۆ مەبەستێکی خەراپ و ناشەرعی هاتووم یان بە شێوەیەکی ناشەرعی هاتووم، تازە باهەر بە دوای ناشەرعی بکەوم ، بەڵکو وەکو کوردەواری دەڵێن ( زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە ) دەبینی لەوێ خوا هیدایەتی دەدات و بە شێوەیەك دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا و بە شێوەیەك نیەت و مەبەستەکەی دەگۆڕێ کە ئەوەی رابردووشی تێ هەڵدێنێتەوەو قەرەبووی دەکاتەوە، واتە: بۆ گوناح چووە بەڵام دەبینی لەوێ تووشی طاعەت و چاکەکاریی و عیبادەتێك دەبێ کە خوای پەروەردگار ئەوەی رابردووشی بۆ دەپۆشێ و لێی دەسڕێتەوە و پاکی دەکاتەوە.

چونکە زۆر کەس هەبووە کە خوای بەخشەرو پەروەردگار لەوێ هیدایەتی داوە ، لەوێ کە ژیانی ئەورووپی و ڕۆژئاواییيەکان دەبینێ لە رووی ئەخلاقیو مەعنەوی و ئینسانیەتیيەوە، لە رووی خێزانی و کۆمەڵایەتیيەوە، لەرووی بەها مەعنەویەکانەوە و بەراوردی دەکات لەگەڵ ئەوەی کە لەوڵاتی مسوڵماناندا هەیە ، ئینجا لەوێ قەدرو و قیمەتی دینی خوای پەروەردگار دەزانێ ، لەوێ نیعمەتی صلەی ڕەحم و خزمایەتی و تۆکمە و توند و تۆڵی خێزان و برایەتی و ڕێزو ئیحترام و بەزەیی و هاوکاری و بە تەنگ یەکدیيەوە بوون و بە دەم یەکەوە چوون و ئەو سیفەت و و خەسڵەتە بەرزانە دەزانێ کە تەنها بەرهەم و زادەی ئیمان و ئیسلامن و بەس لە کۆمەڵگای مسوڵماناندا دەبن، کەواتە کابرا بۆ هەر مەبەستێك و بە هەر شێوەیەك چووبێت ، دوای ئەوەی کە لەوێ نیشتەجێ دەبێت، پێویستە ئەوەندەی لە توانای دایە هەوڵ بدات کە بە شێوەیەك ڕەفتار بکات و بجوڵێتەوە کە هەتا لەوێيە خوا لێی ڕازی بێت ، وە ژیانەکەی بە عیبادەت و طاعەت بۆ حیساب بکرێت.

## سێیەم :چۆنیەتی هەڵسەنگاندنمان بۆ وڵاتانی کافرەستان

سەبارەت بە هەڵسەنگاندن و نرخاندنمان بۆ ڕۆژئاوا وە بۆ هەر وڵاتێکی‌تر لە وڵاتانی نا ئیسلامی واتە: لەو وڵاتەی کە مسوڵمانانیان تێدا نیشتەجێ نین ، یاخود مسوڵمانان تێیاندا کەمینە (اقلیـة)ن وە زۆربەی خەڵکەکانیان نا مسوڵمانە ، جا چ نەصرانی بن چ بت پەرست بن چ خوانەناس (ملحد) بن، خاوەنی هەردینێك بن و هەر بەرنامەیەکیان هەبێت ، نابێ ئێمە لە هەڵسەنگاندنی وەزعی ئەو وڵاتانەدا تووشی نا دادگەری ببین و بێویژدانی بنوێنین ، بۆیە بە کورتی دەڵێین : خەڵکی ئەو وڵاتانە نە هەموو شتێکیان باشە نە هەموو شتێکیشیان خراپە، ئێمەش پێویستە چاك و خراپ و ڕاست و چەوتی ئەو شوێنانە لە یەك جیابکەینەوە بۆ وێنە ئازادیی بیروڕا کە لە ڕۆژئاوا هەیە، مافی مرۆڤ کە تاڕادەیەك هەیە، هەڵبەتە ئێمە زۆر تێبینی‌مان لە سەر ئەوانەش هەیە بەڵام بە تەئکید تا ئەندازەیەك ئازادیی بیروڕا هەیە وە تا ئەندازەیەك ئینسان ژیانی دابین دەکرێ و ڕێزی لێ دەگیرێ ، هەروەها لە ڕووی گرنگی پێدانی لەش ساغی و وە لە ڕووی پێشکەوتنی پیشەسازی و تەکنەلۆژیاوە وە لە ڕووی خوێندەواری و ڕۆشنبیری و ..هتدوە، ئەوانە هەموویان لایەنی ئیجابی و چاکن لەو وڵاتانەدا کە دەتوانین لێیان بەهرەمەند ببین.

بەڵام لەو لاشەوە ژیانی مادده پەرستی ، ژیانی ئاژەڵی و ئارەزووخوازی ؛ هەڵوەشاندنەوەی خێزان، سستی و لێك هەڵوەشانی پەیوەندیی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان ، داوێن پیسی و بڵاوبونەوەی مادده سەرکەرو سەرخۆشکەرەکان ، ئەنجامدانی دزی و ڕێگری و جۆرەها تاوان و خەراپە ئەوانە بێگومان هەموویان شتی بەزەرو خراپن و نابێ توخنیان بکەوین . بەڵێ مسوڵمان دەبێ عاقڵ بێ و لە چاکەکانیانەوە فێری چاکە بێت لە

خراپەکانیشیەوە پەندو عیبرەت وەربگریٚ ، تەماشا بکات ئەو لایەنانەی کە بوونەتە هۆی بەرەو پێش چوونی ڕۆژئاواییەکان و ئەو وڵاتانە، ئەو لایەنانەیان تێدا بکاتە جیٚی سەرنج و تەماشای خۆی و بەهرە و سوودیان لیٚ وەربگرێت، نەك بچێت لە شتە زیانبەخش و خراپەکانیاندا تەماشایان بکات واتە: مسوڵمان دەبیٚ وەك هەنگ (مێش هەنگوینە) بێت کە شیلەی گوڵەکان دەمژێت و دوایی هەنگوینیان لیٚ دروست دەکات نەك وەکو مێشە ڕەشە کە بە سەر خاڵی ڕەش و پیسەوە دەنیشیٚ و دەبێتە مایەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی! چونکە طەبع و میزاجەکەی وایە ! پێشینانیش وتویانە : تەیری گوڵ عاشقی داری ژەقنەمووتە .

کەسانێکمان هەن دەچن بۆ ڕۆژئاوا وا دەزانن کە خەڵکی ئەوروپا و ڕۆژئاوا بە بیٚ بەندو باری و ڕەوشت نزمیی و بە ڕەقص و دانس بەرەو پێش چوون، نەخێر وانییە بەڵکو ئەوان بە داهێنانو بەرەو پێش بردن و گەشەکردنی پیشەسازی و تەکنەلۆجیا بەرەو پێش چوون ، بە تاقیگا( مختبر )یەکان وڵاتیان بەرەو پێش چووە بە کارخانەو کارگەکانیان و بە شەونخونی و ڕەنج و زەحمەت و بە هەوڵ و کۆششی زۆریان، نەك بە بیٚ ماندووبون و بەرهەڵدایی و بەڕەقس و سەما و مەی خۆری و بەکارهێنانی مادده سڕکەرەکان، وە ئەو گەنج و لات و لووتانەی وڵاتانی ڕۆژئاوایی کە لە سەر جادەو شەقامەکان دەبینرێن کە هەر لە خەیاڵی گەدەو داوێنیان دان ، لە ڕاستیدا ئەوانە ئەو کەسانە نین کە شارستانێتی ماددی ڕۆژئاوایان لەسەر شانیان بنیات نراوە و تەکنەلۆژیای ڕۆژئاوا ئەوانە بە گەڕیان نەخستووە و ئەو بەجێماو و داماوانە نین کە وڵاتیان بەرەو پێش بردوە !

بەڵکو ئەو زانا و فەیلەسوف و هەڵکەوتوو و بیر تیژانەی کە هەمیشە لە هەوڵ و کۆشش دانو کاردەکەن و لە تاقیگەو کارگەکان دا شەو و ڕۆژان

پێکەوە گرێ دەدەن و خەریکی دۆزینەوە (إكتشاف)ن لە هەموو بوارەکانی زانست و ئاشنایی بە مرۆڤ و سروشت و دەوروبەر و بوونەوەردا؛ ئا ئەوانەن کە وڵاتانی ئەوروپایان بەرەو پێش بردوە.

کەواتە ئێمە پێویستە تەماشای ئەو جۆرە کەسانەیان بکەین و تەماشای لایەنە باش و ئیجابییەکانی ئەو وڵاتانە بکەین ، نەك لایەنە سەلبی و ناڕێك وپڕ کەم و کوڕییەکانیان کە مایەی پووچەڵی و گەندەڵییانن و درەنگ یان زوو سەریان بە فەتارەت دەدەن.

بە کورتی پێویستە ئێمە هەنگ و مێش هەنگوینە بین شیلەی گوڵی شتە باشەکانیان بمژین نەك مێشە ڕەشە بین بەسەر خاڵە ڕەش و پیس و ناتەواویەکانیانەوە بنیشین ، ئاشکراشە کە هەرکەسە بە پێی میزاج و سروشتی خۆی هەڵسوکەوت دەکات وەك خوای گەورە و توانا دەفەرموێت:

﴿ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَى شَاكِلَتِهِ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَى سَبِيلاً ﴾ (الاسراء:٨٤)

واتە: بڵێ هەر کەسە بە گوێرەی ئەوە کە شایەنیەتی کاردەکات جا پەروەردگارتان زاناترە داخوا کێ ڕێی ڕاستتری گرتوە، پێشینانیش جوانیان گوتوە (گۆزە چی تێدا بێت هەر ئەوەی لێ دەڕژێ )، بۆیە ئەگەر دەمانەوێ هەمیشە عەودالی چاکی و پاکی و ڕوونـاکی بین، پێویستە سەرەتا هەوڵ بدەین هەڵگری چرای ئیمان و هیدایەتی خوای بەرزو مەزن بین.

## چوارەم: چۆنیەتی هەڵسوکەوتی مسوڵمان لەگەڵ خەڵکی ئەو وڵاتانە دا

براو خوشکە مسوڵمانە بەڕێزەکان ! ڕێنوێنی‌و ئامۆژگاری چوارەمم بۆتان ئەوەیە کە مسوڵمان کاتێك دەچێتە وڵاتی کافرەستان‌و لێی نیشتەجێ دەبێ بەدانیدەدان ( أمان ) دەچێتە ئەوێ ، واتە دەبێ ئاگاداربێت و بزانێ کە دەچێتە ئەوێ دەچێتە ژێر سێبەری ئەوان وەك پەنابەر ( لاجئ ) یێك بۆ ئەوێ دەچێت و ئەوان پەیمانی لێ وەردەگرن و ئەویش بۆیان پەنجە مۆر ( ئیمزا ) دەکات کە هاوڵاتییەکی باش بێت و پەنابەرێکی باش بێت .

جا مسوڵمان مادام بەئەمان دەچێتە ژێر سێبەری ئەوانەوە پێویستە ئەوە بزانێ کە ئەوانە واتە خەڵکی وڵاتانی کافرەستان هەرچەندە ئەهلی کوفرن بەڵام ماڵ و سامانیان، ئابروو و کەرامەت و ناموسیان، گیان و خوێنیان، هەموو شتێکیان دەبێ لە دەستی مسوڵمان سەلامەت بێ و نابێ بڵێ چونکە ئەهلی کوفرن و هەرچی بۆم هەڵکەوێ ئەوە بۆ من حەڵاڵ و ڕەوایە !! نەخێر بەڵکو ئەهلی کوفریش وەك ئەهلی ئیسلام خوێن و ناموس و کەرامەت و ماڵ و سامانیان قەدەغەیە و پێویستە پارێزراو بێ ، ئەوەندە هەیە لەکاتی جەنگ دا خوێنی ئەهلی کوفر بۆ تۆ حەڵاڵە و ماڵی حەڵاڵە و بۆ تۆ دەبێتە غەنیمەت ، بەڵام لەحاڵەتی تەعامول و هەڵسوکەوتدا نەفس و ماڵ و ناموسیان وەکو هی مسوڵمانان لە تۆ حەرام و قەدەغەیە ، پاشان تۆ بە پەیمان (عهد) ڕۆیشتوویی بۆ ئەوێ‌و پێویستە ئەو پەیمانە لەگەڵ ئەوان بەریە سەر ، چونکە مسوڵمان نابێ پەیمان شکێن بێت و بێ بەڵێن بێت ، مسوڵمان نابێ شتێك بکات کە لەبواری هەڵسوکەوتدا باری بەلادا لار بێت و باری بەلادا بکەوێت ، کە بێگومان گفت و بەڵێن بردنە سەر و ڕاستگۆیی لەپێش هەموو ڕەوشت و هەڵس و کەوتێکی بەرز و پەسندەوەیەو خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەچەندان ئایەت و فەرمایشت دا جەختیان لەسەر کردوە ، بۆ وێنە : (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ )(المائدة: من الآية١) و﴿ قد )قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، .. .. وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ

رَاعُونَ) (المؤمنون: ١-٨)، پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرموویەتی : (آية المنافق ثــلاث : .. واذا وعد أخلف) رواه مسلم .

بەڵێ لەبواری هەڵس و کەوت (تعامل) دا پێویستە بابای مسوڵمان نموونەی ڕاستگۆیی ، دەست پاکی و ساغی بێ لە گەڵ کافر و لەگەڵ مسوڵماندا.

وە زانایانی ئیسلام دەڵێن : نەك هەر مسوڵمانێك کە دەبێتە پەنابەر لە وڵاتی کافراندا دەبێ دەست لە نەفس و ماڵ و نامووسیان بپارێزێ ، دەڵێن : بەڵکو دروست نیە غەیبەت (غيبة) یشیان بکات ، دەبێ بە زمانیش بە خراپە باسیان نەکات ، واتە بە زمانیش نابێ کەسایەتی و ئابڕوویان بڕوشێنێت مەگەر بەرژەوەندی‌یەکی شەرعی پەکی لەسەری کەوتبێت ، بۆ وێنە کاتێك کە بۆ وڵاتی خۆی دەگەڕێتەوە بۆ مسوڵمانانی بگێڕێتەوە کە ئەوان وەزعیان ئاوا و ئاوایە ئەوە شتێکی ترە ، بەهەر حاڵ کورتەی قسان ئەوەیە کە مادام مسوڵمان دەچێتە وڵاتی ئەهلی کوفر وە دەچێتە ژێر ئەمان و سایەی ئەوان ، پێویستە ئەو عەهد و بەڵێن و پەیمانەی کە لەگەڵ ئەواندا بەستوویەتی، وە لەسەر بنچینەی ئەو پەیماندانە کەئەوان مافی پەنابەری (لجوء) یان پێ داوە پێویستە وەفا بەو بەڵێن و پەیمانە بکات ، وە بە دەست و بە زمان و بەدڵ خۆی بپارێزێ لە ئازاردانیان و زیان پێ گەیاندنیان ، ئەگەر نا گوناحباریان دەبێت ، نەك هەر ئەوەندەش بەڵکو لەسەری پێویستە کە بە هەر شێوەیەك کە بۆی دەلوێ خێرو چاکەیان پێ بگەیەنێ ، چونکە مسوڵمان چاکەکاریی لەسەر پێویستە یان لایەنی کەم پەسند کراوە : (وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)(البقرة: من الآية١٩٥) وە (وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْناً )(البقرة: من الآية٨٣) ئنجا پێویستە مسوڵمان لەبەرانبەر چاکەی پەنادان و داڵدەدانی ئەواندا چاکە بکات ، چونکە : (هَلْ جَزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ) (الرحمن:٦٠) ، دیارە ئەو چاکەکاریی‌یەش سەرجەم جۆرو بوارەکانی ماددیی و مەعنەویی دەگرێتەوە و ئایەتی : (لا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إليهم)(الممتحنة: من الآية٨) ئاماژەی پێ دەکات ، چونکە (تبروهم) لایەنی مەعنەویی و (تقسطوا اليهم) یش لایەنی ماددیی دەگرێتەوە.

## پێنجەم: بوار و مەیدانەکانی خزمەتکردنی

## مسوڵمان لەو وڵاتانەدا

لـەم ڕێڕوونـی و ئامۆژگاریی‌یـەی پێنجەمـەشماندا خـوا یاربـێ تیشـکێکی خێرا دەخەینە سەر ئەو بوارانەی کە ئینسانی مسوڵمان دەتوانێ خزمەتێکیان تێدا بکات لەکاتێکدا کە لەو وڵاتانـەدا نیشـتەجێ دەبێـت ، ئایـا دەتوانـێ چ خزمەتێك بکات بە ئیسلام و مسوڵمانان :

١- لەبواری بانگەواز و فێرکردندا : چ لەگەڵ خەڵکی ئەسڵی ئەو وڵاتانە و چ لەگەڵ خەڵکی دیکەی پەنابەر کە لـەوێ نیشتەجێیە . مسوڵمان هەمیشە دەبێ خاوەنی قسەی خێر بێت چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویـەتی : (والکلمة الطّیبة صدقة) (رواه مسلم)، دیسان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (بَلّغوا عَنّي ولَو آیة ) (رواه البخاري) واتە :ئەگەر ئایەتێکیش بێت لەمنەوە بیگەیەنن .

بەڵێ مسوڵمان پێویستە هەمیشە بانگخواز و بانگکەر بێ بۆ ڕێگەی خوای پەروەردگار ، چ لەگەڵ خەڵکە ئەسڵی‌یەکەی ئەوێ ،چ لەگەڵ خـەڵکی دیکـەدا ئەوەندەی کە بۆی بگونجێ ، چونکـە بـانگخواز (داعـي) بـوون خەسـڵەتێکی ڕیشـەیی مسـوڵمانە وەك خـوای کاربـەجێ لـە پێناسـەی مسـوڵمانانی ڕاستەقینەدا فەرموویەتی: (وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ)(آل عمران: من الآیة١٠٤).

٢- لـەڕووی ڕاگـەیاندن (اعـلام) ەوە : کـە ئـەویش هـەر جۆرێکـە لـە جۆرەکانی بانگەواز و خەڵك بەرەو لای خواو ئایینەکـەی بـانگ کـردن، بـەڵام پانتایی‌یەکی زیاتری هەیەو شێوەیەکیشە لە شێوەو شێوازەکانی بانگەواز کە بێگومان شێواز و چۆنیەتی دیکەیشی زۆرن .

٣- لەڕووی خەباتی سیاسی و دیبلۆماسی‌یەوە : بەتایبەت ئەگەر لە کۆمەڵێکی ئیسلامی دابێ ، پێویستە ڕووی گەشی ئەو کۆمەڵە ئیسلامی‌یە یان ڕووی گەشـی میللەتـە مسـوڵمانەکەی بخاتـە بـەرچاویان و ڕەوایـی کێشـەو

گرفتەکانی و دەنگی زوڵاڵی پەیامەکەی بەو خەڵکەی ئەویَ بگەیەنێت و لەگەڵ دام و دەزگاکانیاندا و لەگەڵ پیاوانی سیاسییاندا و لەگەڵ ئەدیب و نووسەرانیان و لەگەڵ ڕۆشنبیرانیاندا ژیرانەو لێزانانە گفت و گۆ بکات و ئەوەی پێویستە بۆیان باس بکات و جوان جوان لەباس و خواسی میللەتەکەی و پەیامو بەرنامەی کۆمەڵ و لایەنەکەی حاڵییان بکات و بەرچاویان ڕۆشن بکاتەوە ، چونکە زۆر ڕاستە کە گوتراوە : (الناس أعداء لما جهلوا) .

٤- لەڕووی کۆمەکی ماددییەوە: بابای مسوڵمان دەتوانێت لەوەی کە دەستی دەکەوێت جا چ کە بۆ خۆی کەسابەتی حەڵاڵ دەکات ، یان ئەوەی کە لە بەرانبەری نیشتەجێ بوونیدا لەویَ دەیدەنیَ و هاوکاری دەکەن ، بە سادە ژیان (تَقشُف) ەوە ژیان بەرێتە سەریَ ، وە شتێك پاشەکەوت بکات ، تا بتوانیَ یارمەتی خەڵکی مسوڵمانی نەداری پیَ بدات چ لەویَ چ لێرە ، وە یارمەتی ئەو کۆمەڵە ئیسلامییەی پیَ بدات کە نوێنەریەتی ، یان یارمەتی خزمانی خۆیَ پیَ بدات ، بەهەر حاڵ کۆمەکی ماددیش یەکێکە لە و چالاکییە ئیسلامی و لەو طاعەت و عیبادەتانەی کە لەویَ دەتوانیَ ئەنجامیان بدات .

٥- مەسەلەی بازرگانی: بۆ کەسانێك کە دەستیان دەڕوات و توانایان هەیە لەو ڕووەشەوە دەتوانن خزمەتێکی باش بکەن ، دیارە بازرگانی کردن لەو بوارانەدا کە شەریعەتی ئیسلامی بە ڕەوایان دەزانێت ئەگەر نا بازرگانی کردن بە شتی حەڕامەوە وەك گۆشتی بەراز و شەراب و ماددە سڕکەرەکان (المخدرات) و ئەو شتانەی کە لەشەریعەتی ئیسلامیدا حەڕام کراون ، بێگومان پارەو دەستکەوتەکەشی حەڕامەو دەبیَ خۆیَ لیَ بپارێزیَ ، یان پارەی سوود (رِبا) بەهەمان شێوە حەرامە و دەبیَ خۆیَ لیَ بپارێزیَ ، چونکە

خوای دادگەر بەڕاشکاوی فەرموویەتی : (وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا) (البقرة: من الآية٢٧٥) واتە: وە خوا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردوە وسوودی حەرام کردوە.

٦- وە فێر بوونی زانست و بەکارهێنانی ئەو ئامراز و ئامێرە تەکنۆلۆجیانەی کە لەوێ هەن : وەك کۆمپیوتەر و هەر ئامێرێکی دیکە کە دوایی کارو پیشەیەکی پێ فێر بێت ، یان خزمەتێکی پێ بکات ، ئەوەش بێگومان یەکێکە لەو چالاکی و ئیشانەی کە ئەگەر بێت و ، ئەنجامی بدات بۆی بە طاعەت و عیبادەت لەقەڵەم دەدرێت ، هەروەها کە گەڕایەوە دەتوانێ ئەو شتانەی کە وەری گرتوون و فێریان بووە خەڵکی دیکە فێر بکات و لێی بەهرەمەند بن .

٧-وە فێر بوونی زمان: ئەمیش کارو چالاکییەکی گرنگ و کاریگەر و پێویستیشە بۆ مسوڵمانان.

ئنجا دیارە لەسەرووی هەموو ئەوانەشەوە هەر برایەکی مسوڵمان و هەر خوشکێکی مسوڵمان پێویستە هەوڵ بدات ئاوێنەیەکی ساف بێت و ڕوویەکی گەش و درەوشاوەی ئیسلامەتی پیشان بدات لەهەموو ڕوویێکەوە لەهەڵس و کەوتی‌دا ، لەبەرو مەجلیسی و لەبەرێگەدا ڕۆیشتنی‌دا ، لە چاك و چۆنی و سەلام کردنی‌دا ، لەکارکردنی بە ئەمانەت و پاکی و سەرڕاستی‌دا ، لە قسەو وتو وێژی‌دا ، لەپەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکاندا ، لەهەموو ڕووەکانەوە دەبێ هەوڵ بدات ئاوێنەیەکی ساف بێت کە ڕووی گەشی ئیسلام پێشان بدات ، وە لە ئاستی بەرزی ئیسلامدا ڕەفتار بکات و هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکدا بکات ، کە بێگومان خەڵك بانگ کردن بۆ دینی خوا بە ڕەوشت و ڕەفتاری شەرعی‌یانەی بەرزو جوان بە ئاکار و بەهەڵوێستی پەسەند ، چاکترین شێوازی خەڵك بانگ کردنە ، وە زمانی کردەوە و ڕەفتار ڕەوانترین زمانە کە هەموو کەس لێی حاڵی دەبێت .

## شەشەم:كاركردن و جم‌وجۆڵ بەكارامەیی و لێزانانە و وردبینانەو دووربینانە

كورتەی ئەم ئامۆژگاریی و ڕێپوونی‌یەشم ئەوەیە كە شێواز و میكانیزمی كاركردن و چالاكی ئەنجامدان لەو وڵاتانە پێویستە وێڕای شەرعی بوونی زۆر حەكیمانە و لێزانانە بێت، جارێ مسوڵمان پێویستە لەهەموو شتێكی‌دا هۆشیار و وریا بێت ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت : (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا خُذُوا حِذْرَكُمْ فَانفِرُوا ثُبَاتٍ أَوِ انفِرُوا جَمِيعاً) (النساء:٧١)،

واتە : (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە وریایی خۆتان وەربگرن دەستە دەستەو بەتێكڕا جیهاد و جەنگ بكەن لەڕێی خوادا) .

واتە لە حاڵەتێكدا كە خوای پەروەردگار فەرمان بە مسوڵمانان دەكات چ بە شێوەی دەستە دەستەو چ بە شێوەی تێكڕا جەنگ و جیهاد لەڕێی خوادا بكەن، لەپێش ئەوەدا فەرمانیان پێ دەكات بە وریایی و دوور بینی (حـذر) پاشان سەرنج دەدەین كە هاوەڵانی ئەشكەوت (اصحاب الكهف) ڕەزای خوایان لەسەر بێت ، كاتێك كە بەخەبەر دێن و بێدار دەبنەوە دوای (٣٠٩) سێ سەدو نۆ ساڵ خەوتن، كە دیارە هەست بە برسێتی دەكەن، دەڵێن: (فَابْعَثُوا أَحَدَكُمْ بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنْظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَاماً فَلْيَأْتِكُمْ بِرِزْقٍ مِنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَداً)(الكهف: من الآية١٩) واتە : (یەكێكتان بنێرن بەم پارە و دراوە بچێ بۆ شار با تەماشا بكات كام خواردنەی حەڵاڵترە با بژێوێكتان لەو ڕۆزی‌یە حەڵاڵە بۆ بێنێت بەڵام با زۆر وریا بێت و نەهێڵێ هیچ كەس پێتـان بزانـێ، وشـەی (تلطف) واتە : (وریایی و گورج و گۆڵی و پەنهانكاریی و چوست و چالاكی بە شێوەیەك كە خەڵك هەستی پێ نەكات).

كەواتە مسوڵمان چ لە كاتی جەنگدا چ لە كاتی كڕین و فرۆشتن و چوونە بازاڕ و هەڵس و كەوتدا ، واتە چ لە حاڵەتی جەنگ (حـرب) و چ لە حاڵـەتی

ئاشتی (سلم)دا پێویستە وریا و لەسەر هەست بێ و بە لەباریی کاری خۆی بکات و وەستایی و لێزانی تێدا ڕەچاو بکات.

بۆیە ئێمە پێمان وایە ئێستا لەم ڕۆژگار و واقیعەدا باشترین شێواز و میکانیزم بۆ کارو چالاکی ئیسلامی لەو وڵاتانەدا ئەوەیە کە لەڕێی مزگەوتەکانەوە بێت ، کە بێگومان مزگەوتەکان دەکرێ و دەگونجێ بکرێنە باشترین مەڵبەندی بانگەواز و پەروەردەو فێرکردن و ڕاگەیاندن و چالاکییەکانی دیکەی ئیسلامی.

هەروەها لەڕێی مەڵبەندە ڕۆشنبیرییەکان و لەڕێی دام و دەزگا خێرخوازییەکان و هاو وێنەی ئەوانەوە ، کە بێگومان لەو وڵاتانە مەجالی فراوان هەیە بۆ هەموو ئەو جۆرە چالاکییانە بە تایبەت مەڵبەندە ڕۆشنبیرییەکان ودام و دەزگا خێرخوازییەکان ، ئەوانە بێگومان باشترین کەناڵن بۆ ئەوەی کە مسوڵمان کارو چالاکی خۆی لە چوارچێوەو لەژێر سایەیان دا ئەنجام بدات . .

مەبەستم ئەوەیە کە بەڕاستی دەبێ مسوڵمان لەو وڵاتانەدا وریا بێت و نابێ بە شێوەیەك کار بکات کە هەر لەڕێوە نیشانەی پرسیار لەسەر خۆی پەیدا بکات ، یان هەر لەڕێوە کارێکی وا بکات کە بە زمانی خۆی خۆی بە (تەڵە)وە بکات، بەڵێ ئامانجی شەرعی وکاری شەرعی دەبێ بە لێزانانە و حەکیمانە ئەنجام بدرێت ، وە بە شێوازی شەرعیو بە شێوازێکی وا بێت کە پێچەوانەی ڕێ و ڕەسم (قوانین) ی ئەو شوێنانە نەبێ کە دوایی کابرا کارەکەی بە یاساغ و بە قەدەغە لەقەڵەم بدەن و بیانووی پێبگرن .

بەکورتی مسوڵمان دەبێ لەو وڵاتانەدا بە شێوەیەك کار بکات بیانوو بەدەستەوە نەدات و شتێکی وا نەکات کە بێ یاسایی بێت (بەمەرجێك بێ شەرعی و گوناح نەبێت) وە نابێ دەرفەت و بوار بە دام و دەزگاکانی ئەو دەوڵەتانە بدات کە بە هانەی پێ بگرن و یەخەی بگرن .

## حەوتەم: جێبەجێ کردنی ئەرکە شەرعی‌یەکان لەهەموو حاڵێك دا

ڕێڕوونی و ئامۆژگاری حەوتەمیشم بۆ خوشك و برایانمان ئەوەیە کە براو خوشکانمان لەهەر شوێنێك هەن دەبێ ئەرکە شەرعی‌یەکان وەك پێویست جێبەجێ بکەن .

یانی ماقووڵ نیە وگونجاو نیە لەوێ برایەك یان خوشکێك ئیدیعا بکات و بڵێ : من بەخەم گەل و میللەتەکەمەوەم و بەخەم ئەو کاروانە جیهادی‌یەوەم و بەخەم کۆمەڵی ئیسلامی‌یەوەم ، بەلام لەوێ بۆی بگونجێ نوێژەکانی بەجەماعەت بکات ، کەچی بەتەنیا بیانکات! ، یاخود خوانەخواستە نوێژەکانی نەکات و ڕۆژووەکانی نەگرێت ! یان هەر واجبێکی دیکە بچوێنێ و گوێی پێنەدات ! ، چونکە تۆ جارێ کە بە کەڵکی خۆت نەهاتووی چۆن بەکەڵکی خەڵکی دێی ؟! (مَنْ لَمْ یکنْ لِنَفسِهِ فَکَیْفَ یکونُ لِغیرِه؟) بەڵێ نابێ ئینسان خۆی فریو بدات کە بڵێ : مادام من کار بۆ ئیسلام و بۆ کۆمەڵی ئیسلامی دەکەم و خەمی خەڵکی دەخۆم ، ئەگەر بۆ خۆشم کەمتەرخەمی بکەم مەسەلەیەك نیە! نەخێر ، تا بە کەڵکی خۆت نەیەی بەکەڵکی خەڵك نایەی، تا بۆ خۆت ئەهلی طاعەت و عیبادەت و تەقوا و پارێز نەبی، بۆ خەڵکی دیکە کارەکەت بەرەکەتی نابێ و بەرهەمی نابێ .

وە خۆ پاراستن لە گوناح و لە قەدەغە کراوەکان ، بێگومان ئەوەش زۆر گرنگە بەهەموو جۆر و شێوەکانیانەوە ، وە پاشان بەڕاستی مسوڵمانان لەو ولاتانە ئەگەر توێشوو و زاد و زەخیرەیەکی ڕووحی

باشیان نەبێت لە : قورئـان خوێنـدن ، لـەزیکر و پاڕانـەوە ، لـە نوێـژ و ڕۆژووی سـوننەت ، وە لـە جار جار چوونـە ئیعتکـاف و طاعەتـە جیـا جیاکانی دیکە ، وە لەنەبوونی بۆشایی (فراغ)[٤] ، وە لە وریا لە خۆبوون بۆ ئەوەی نەکەونە ژێر کاریگەریی ئەو واقیعەی ئەوێ بەتایبەتی تەماشا کردنی فلیمی خراپ ، یان دیاردە و دیمەنی خراپ و ، ئەو ناشەرعی وُ بێ ڕەوشتی‌یانەی کە لەوێ ڕەواجیان هەیە لە جادەو شەقام و بازاڕەکان و لەشـوێنە گشـتی‌یەکاندا ،دەبـێ مسـوڵمانان زۆر لـە خۆیـان وریـا بـن توێشوویەکی چـاکی طاعـەت و تـەقوایان پـێ بێـت تـاکو نەکەونـە ژێـر کاریگەریی عادەت و نەریت و فەرهەنگی جاهیلی‌یانەی ئەو وڵاتانەوەو توانـای خۆڕاگریی و بەرهەڵسـتی‌یان هـەبێت ، نـەك خوانـەکردە بـەهۆی لاوازیی ئیمان و کەمی تەقواو طاعەتەوە بەمەرەدی ئەو کەسە بچن کە بۆ ڕیش چوو بوو بەڵام سمێڵەکانیشی لەدەس چووٴ! ئەوانیش کە بە حساب چوونە ئەوێ کە خزمەتێك بکەن ، وە کارێکی خێر ئەنجام بدەن ، کەچی لـەوێ ئیمـان و ئیسـلام و طاعەتەکەشیان بدۆڕێنـن و لـەو سـەرەوە بـە دەستی خاڵی بگەڕێنەوە !



(٤) وەك وتراوە : (ثلاثٌ مفسدٌ للمرءِ اي مفسدة الشبابُ والفراغ والجِدة) واتە : (سێ شت زۆر دەبنە مایەی تێکدانی ئینسان : گەنجێتی و دەست بەتاڵیی و هەبوون)

## هەشتەم: ئاگالێبوون و چاودێریی کردنی خێزان و خزم و دراوسێ و ئاشنایان

ئامۆژگاریی یەکی دیکەی دڵسۆزانەم ئەوەیە کە براو خوشکانمان دەبێ هەم لە خۆیان وریا بن هەم لە ماڵ و خێزانیان بەتایبەتی کوڕ و کچیان ، چونکە بێگومان کوڕ و کچەکانیان ئەمانەتی ئیسلامن لە دەستیاندا ، جا دیارە ئەگەر لەسەرەتاوە لێیان وریا بن و چاك پەروەردەیان بکەن و ئاگایان لێیان بێت و زەحمەتیان لەگەڵ بکێشن ، بۆ دوایی ئاسانتر دەبێت ، وە خوا نەکردە ئەگەر دوایی تووشی لادان و خراپەیەکیش ببن ، خوای پەروەردگار لەسەر ئەوە سزایان نادات ، چونکە مادام لەو کاتەدا کە ئەو منداڵانە لەبەر دەستتن و مەجال و دەرفەتت هەیە لەگەڵیان خەریك بی و خۆت زەحمەت دا و ئەرکت لەگەڵ کێشان ، دوایی کاتێك ئەو منداڵە تەکلیفی دەکەوێتە سەر خۆی و باڵغ دەبێ ، مادام کەمتەرخەمی تۆی لەگەڵدا نەبێ ، ئەگەر لاش بدات و بەرەو خراپەش بڕوات ئەو کاتە تۆ گوناحبار نیت ، بەڵام تۆ لەسەرتاوە خۆتی لەگەڵ ماندوو نەکەی و زەحمەتی لەگەڵ نەکێشی هەر لەبەر ئەوەی دوو دۆلار زیاتر پەیدا دەکەی ئاگات لە ماڵ و منداڵەکانت نەبێ و ئاگات لە ڕێپروونی کردن و ئامۆژگاری یان نەبێت ، یان لەبەر ئەوەی کە دڵیان لەخۆت ڕازی بکەی و گلەییت لێ نەکەن ، یان شتێکی وا نەکەی کە پرتەو بۆڵەت لەسەر بکەن ، تۆ وێڵ و ئیهمالیان بکەی، دوایی تووشی هەر لادان و ئینحرافێك ببن، چونکە لەسەرەتاوە کەمتەرخەمیت هەبووە بێگومان لەگوناحەکانیاندا شەریك و هاوبەش دەبی، خوای دادگەریش

فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُـوا أَنفُسَـكُمْ وَأَهْلِيكُـمْ نَـاراً وَقُودُهَـا النَّـاسُ وَالْحِجَارَةُ) (التحريم: من الآية٦)، وە فەرموویەتی: (وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِـالصَّلاةِ...) (طـه: من الآية١٣٢)،

هەروەها جگە لەماڵو منداڵو خێزانی خۆی – دیارە هەرکەسە بەپێی توانای خـۆی – دەبـێ لـەخزمو دۆسـتی لـە دەرو دراوسـێی لەدۆسـتو هاوەڵانو لەوانەی لێیەوە نیزیکن، ئاگادار بێ لێیان وریا بێت.

وە بێگومـان ئینسانی مسـوڵمان ئەگـەر بێتو لـەو وڵاتانـە تەنها بێو هەست بەتەنیایی بکات، زیاتر مەترسی ئەوەی لێدەکرێت کە بکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو واقیعە پیسو گەندەڵو خراپەی ئەوێ، بەڵام ئەگەر مسوڵمانان بەدەم یەکەوە بنو هەفتانە یان مانگانە، یان ئەگەر شوێنیان لەیەك نزیك بێت هەفتەی چەند جارێكو مانگی چەند جارێك پێکەوە کۆببنـەوە، بگـرە تەنانـەت ئەگـەر هـەر بەتەلـەفۆنیش بـێ یـەکتر بەسـەر بکەنەوەو یەکتر هان بدەنو قسەی خێر بۆ یەکتر بکەن، یان لەمزگەوت یەکتر ببینن، ئەوە بێگومان دەبێتە هۆی دەمەزەرد بوونەوەیان و مشتو ماڵی زەینو دڵیان، وە ئەگەر کەسێك بەخۆشیەکیشی لێپەیدا بووبێتو کەموکوڕیەکیشـی تـووش هاتبـێ، کـاتێك برایـەکانی دیکـەیو خوشکەکانی دیکەی دەبینێت، زۆر نیزیکە کە ئەو سستیو خاویەی نەمێنێتو گورجو گۆڵ بێتەوە، بەڵێ یەکتر دیتنو یەکتر بەسەرکردنەوەو ئاگا لەیەکتر بوون بەتەئکید خاڵێکی زۆر گرنگە.

## نۆیەم: هەست کردن بەبەرپرسیارێتی بەرانبەر
## بە کۆمەڵگاو میللەت

نۆیــەمین ئامۆژگـاریی دڵسۆزانەشم ئەوەیــە کــە مســوڵمانان پێویســتە لەسەریان بەتەنگەو خەمی میللەتو کۆمەڵگای خۆیانەوە بنو کۆمەڵو خەڵكو میللەتەکەیانیان لەبیر نەچێتەوە!

جا چ ئەو میللەتو کۆمەڵگایەیان کەلەوێ لەگەڵیان پەنابەرەو نیشتەجێی ئەوێیە یان بەسەفەر چووە بۆ ئەوێ، وە چ ئەوەی کەلێرە بەجێی هێشتوون، واتــە مســوڵمان دەبــێ هەســت بکــات بــەوەی کــە ئەندامێکــە لەمیللــەتو کۆمەڵگایەكو ئەندامە لەکۆمەڵێك و بەرانبەر بەو خەڵكو کۆمـەڵگاو میللـەتو کۆمەڵە بەرپرسیارە، وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (كُلُّكُمْ راعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْؤُلٌ عَنْ رَعِيَّته) متفق عليه، واتە: هەرکامێك لەئێوە شوانەو چاودێرەو بەرپرسیارە بەرانبەر بەو خەڵكو کەسانەی کەبەقسەی دەکەن یان قسەی لەناویاندا دەڕواتو قسەی لێوەردەگرن.

هەرکەسێك بەئەندازەی قســە ڕۆیشــتنو دەســت ڕۆیشــتنی بەرپرســیارە بەرانبەر بەخەڵكو میللـەتی خـۆی، دیـارە ئێمـە بەرانبـەر بەهـەموو ئوممـەتی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) بەرپرسیارین، بەڵام دەتوانین بەرپرسیارێتی خۆمان لەچەند بازنەیەکی لەنێو یەکدا دیمەن بکێشین بەم شێوەیە: پێش هەموو کەس ئینسان بەرانبـەر بەخۆی بەرپرسـیارە، وەکـو خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: (فَقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ )(النساء: من الآية٨٤) واتـە: ئەی موحەممەد ﷺ لەڕێی خوادا بجەنگە تەنیا خۆتت لەسەرەو بەرانبەر بەخۆت بەرپرسیاری.

لەسەرەتاوە ئینسان بەرانبەر بەخۆی بەرپرسیارە، پاشان بەرانبـەر بەماڵو منـداڵو خێزانی، وەکو خـوای پـەروەردگار دەفەرموێ: (وَأْمُرْ أَهْلَـكَ بِـالصَّلاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا)(طه: من الآية١٣٢)، واتە: (ماڵو خێزانت فەرمان پێبکە بە نوێژکردنو

ئارامیشی لەسەر بگرە) واتە: صەبرو ئارام لەسەر ئەوە بگرە کەماڵو منداڵیش ئەهلی نوێژو تاعەت بن.

پاش ئەوە ئینسانی مسوڵمان بەرانبەر بەخزمو عەشیرەتو هۆزەکەی بەرپرسیارە، وەکو دەفەرموێ: (وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ) (الشعراء:٢١٤) واتە: وەخزمو تیرە نیزیکەکانت ئاگادار بکەوە ئینجا بەرانبەر بەنەتەوەو قەومەکەی، وەك دەفەرموێ: (وَإِنَّهُ لَذِكْرٌ لَكَ وَلِقَوْمِكَ وَسَوْفَ تُسْأَلُونَ) (الزخرف:٤٤) واتە: ئەمە یاد خەرەوەیە بۆ خۆتو بۆ نەتەوەکەت، ئینجا بەرانبەر بەهەموو بەشەریەت بەرپرسیارە، وەك خوای پەروەردگار بەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً)(سبأ: من الآية٢٨) دیارە ئێمەش شوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرە بەرێزەین کەواتە دەبێ هەست بەسەرجەم ئەوجۆرە بەرپرسیارێتی‌یانە بکەین.

راستە ئێمە وەك کوردێك رەنگە لەبەرانبەر کوردێکدا زیاتر بەرپرسیار بین چونکە زیاتر دەتوانین قسەی خێری بۆ بکەینو کاریگەریمان لەسەری هەبێت تاکو بەرانبەر بە برایەکی مسوڵمانی عەرەبو تورکو فارسو ... هتد، دیارە بەرانبەر بەوانیش هەر بەرپرسیارین بەڵام کوردەکە لەبازنەیەکی نزیکتردایەو بەئیعتبارێك لەتۆ نزیکترە، چونکە تۆ ئاسانترو زووتر دەتوانی کار لەو بکەی، وەئەگەر کەمتەرخەمیش بکەی رەنگە ئەو زیاتر گلەییت لێبکاتو بڵێ: کاکە من هەر هاوزمانێکتم و هاونیشتمانێکم بۆچی خەم لەمن ناخۆی؟!

بەهەرحاڵ لەئیسلامدا ئەو حەقو مافانەو ئەو ئەرکو بەرپرسیارێتی‌یانە هەرکامێکیان لەشوێنی خۆیدا پێویستنو هیچیان لەسەر حیسابی هیچیان نین، وەئینسان تا تواناشی زیاتر بێ بازنەی بەرپرسیارێتی‌یەکانیشی فراوانتر دەبێ، پێغەمبەری ئێمە ﷺ لەبەرئەوەی خوای پەروەردگار بەدوایین پێغەمبەر ناردوویەتی بۆ هەموو بەشەریەت، بەرانبەر بەهەموو بەشەریەت بەرپرسیار بووە، بەڵام پێش هەموو کەس بەرانبەر بەخۆی (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) (العلق:١) ئینجا پاش ئەوەی خۆی هیدایەتی خوای وەرگرتوە، ئەمجار بەرانبەر

بەماڵو خێزانی (وَأمُرْ أهْلَكَ بِالصَّلاةِ ) (طه: من الآية١٣٢)، ئەمجار بەرانبەر بەخزمو عەشیرەتی، ئەمجار بەرانبەر بەگەلو نەتەوەکەی، پاشان بەرانبەر بەهەموو بەشەریەت، ئێمەش بەهەمان شێوە ئاوا لەهەموو ئەو بازنانەدا ئەرکی بەرپرسیارێتیمان لەسەر شانە، دیارە هەرکەسە بەپێی توانای خۆیو بەپێی بۆ رەخسانو بۆ لوانی.

بێگومان ئەنجامدانی ئەرك بەرانبەر بەخەڵكو میللەت چ لەوێو ئەوانەی کەلەوێن، چ ئەوانەی کەلێرەن بەچەند شێوەیەك دەبێت، بەسەردانو هاموشۆ ئەوەی کەلەوێ نزیکە، یان سەردان دەکاتەوە بۆلای ئەوانەی کەلێرەن، یان لەرێی نامەو فاکسو ئەنتەرنێتو تەلەفونەوە، ئەوانە هەموویان چەند شێوازو چەند هۆیەکن بۆئەوەی ئینسان لەو خەڵكو میللەتە دانەبرێت.

بەتایبەتی ئەگەر ئەو برایە یان ئەو خوشکە سەر بەلایەنێکی ئیسلامی بێت، ئێمە بەتایبەت کەبۆ ئەندامانو دۆستانو لایەنگرانی (کۆمەڵی ئیسلامی/ الجماعة الأسلامية) قسە دەکەین، ئەوە پێویستە هەمیشە لەگەڵ ئاواتو لەگەڵ ئازارو لەگەڵ خولیاو ئومێدەکانی ئەو کۆمەڵو ئەو خەڵکە مسوڵمانەدا بێت کەخۆی بەئەندامێك لەوان دەزانێ، هەست بەئێشو ژانو ناسۆرەکانیان بکات، وە لەگەڵ خۆشییەکانیاندا خۆشحاڵ بێتو لەگەڵ مەینەتییەکانیاندا ناخۆشحاڵ بێت، وەئاگای لێیان بێتو سەریان لێبداتو پەیوەندییان لەگەڵ نەپچرێت، هەم بۆ خۆی وەك تاعەتو عیبادەتێك وەك ئەرکێکی شەخسی خۆی، وە هەم بۆ ئەو کۆمەڵەش بێگومان قازانجە.

دیارە پێویستە بەهاندەری ئیمانی خۆمانو لەسەر بناغەی ئیمانو مسوڵمانەتیمان، ئەو ئەرکو بەرپرسیارێتیو ئەو هەستو نەستە لەئێمەدا پەیدا بێت، بەڵام وەکو عیبرەتو پەند لێوەرگرتن ئەگەر جارجار ئینسان خۆیشی بەراورد بکات لەگەڵ خەڵکی دیکەش خراپ نییە، ئێمە بۆ وێنە سەیری ئەندامو لایەنگرێکی (pkk) دەکەین چ پیاو بێت چ ژن کەحزبێکی

عـەلمانیو غـەیرە ئیسـلامییەو وەتـەنیا بـۆ دنیـاو لـەچوارچێوەی دنیـادا کاردەکەن، بەڵام دەبینین چ لێبڕانو قوربانیدان (تضحية)ێکیان هەیە لەپێناو خۆیـانو ئامانجـەکانیدا کەهـەرچۆن بێـت لـەچوارچێوەی دنیـا دەرنـاچن چ فیداکـارییو بەخشـندەیییەك دەنوێنـن! بـەڵام ئێمـە وەك مسـوڵمان کەهـەم ئومێدی بەختەوەرییو عیززەتمەندیی دنیامان بەئیسلام هەیەو هەم ئومێدی سەرفرازییو ڕووسووریی قیامەتیشمان پێیەتی، واتە ئێمە لەبازنەی فراوانی دنیاو قیامەتدا کار بۆ ئیسلام دەکەین، دیارە پێویستە لێبڕانو فیداکارییو قوربانیدانو بەخششمان زۆر زۆر لەهی خەڵکی دیکە زیارت بێت، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (وَمِنَ النَّاسِمَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّـهِ وَالَّذِيـنَ آمَنُـوا أَشَـدُّ حُبّـاً لِلَّـهِ)(البقرة: من الآيـة١٦٥) واتـە: (لەخـەڵکی کەسـانێك هـەن کەهەندێك هاوتاو پەرستراو پەیدا دەکەن بۆ خوا کەوەك خوا (دەیانپەرستن) و خۆشیان دەوێن، بەڵام ئەوانەی ئەهلی ئیمانن خوای پەروەردگاریان خۆشتر دەوێ لەخۆشویستنی ئەو بت پەرستانە بۆ پەرستراوەکانی خۆیان).

جـا پێویسـتە ئێمـە بـەکردەوەو هەڵوێسـت دەریبخـەینو ئیسـپاتی بکـەین کەخۆشەویستی ئێمە بۆ خواو پێغەمبەری خوا (؟؟بۆ دینو شەریعەتی خوا بۆ خـاكو میللـەتی خۆمـان لـەژێر سـایەی شـەریعەتی خـوادا، خۆشەویسـتیو بەتەنگەوەبوونی ئێمەو لێبڕانو بەخشینی ئێمە زیاترە لەهی خـەڵکی دیکـە، ئەوەش بێگومان بەدەعواو لاف لێدان نابێت، بەڵکو دەبێ بە هەڵوێستو کردار ئـەوە بسـەلمێندرێو دەربخـرێ، ئەگـەرنا قسـە فـەقیرەو هـەموو کـەس پێی دەوێرێ!

## دەیەم و کۆتایی: وەڵامی چەند پرسیارێك و ڕوونکردنەوەی چەند ڕاستی‌یەك لەبارەی کۆمەڵی ئیسلامیی‌یەوە

دەزانین کەپاش بنیات نران و ئیعلانکردنی (کۆمەڵی ئیسلامیی) وە خوا حافیزی کردنی ئێمە مانان لەماڵی (مەلا عەلی هەڵەبجەیی) هەندێك پرسیارو ئیشکال لەمێشك و دڵی گەلێك کەسدا لەو بارەوە دروست بوونە، جا من هەوڵ دەدەم لەدوو توێی ئەم (٣) خاڵەدا ئەوەی لەوبارەوە بەپێویستی دەزانم بەگوشراوی بیخەمەڕوو:

١-سەرەتا ئەو پرسیارە دەکرێ و ئەو ئیشکالە هەیە کە (کۆمەڵی ئیسلامیی) بۆچی دروست بووە؟ ئایا نەدەگونجا هەر پێکەوە بن؟ ئایا هەرچۆن بێت هەر بەیەکەوە بوون باشتر نەبوو؟ چ پاساو و هۆکارێك ئێوەی ناچار کرد (کۆمەڵی ئیسلامیی) بنیات بنێن و ئیعلانی بکەن؟

من بەکورتی لەوبارەوە دەڵێم: لەڕاستی‌دا ئیعلانکردن و بنیات نانی (کۆمەڵی ئیسلامیی) زەرووەتێکی شەرعی و واقیعی بوو، واتە هەم بەڵگەو پاساوی شەرعی‌مان بەدەستەوە هەیە کەناچار بووین (کۆمەڵی ئیسلامیی) ئیعلان بکەین، وەك لەچەند نامیلکەیەکدا بەناوی (بەڵگەو پاساوە شەرعی‌یەکانی بنیات نانی کۆمەڵی ئیسلامیی) ئەو شتانەمان باس کردووە، وە بە (کاسێت)یش ناردوومانە و بڵاوکراوەتەوە.

وەهەم کەتەماشای واقیعمان دەکرد بەڕاستی دەمانبینی کە(بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی) قەرزدار بوّوە لەسەر وجوودەکەی، واتە مسوڵمانان لەسەر هەبوونی (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی) قەرزدارو عەیبدار بوون، بۆچی؟ چونکە لەژێر سایەو سێبەری (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی)دا شتی وا دەکراو تەصریحاتی وا دەدراو تەنازولاتی عەقیدەیی وا دەکراو ناشەرعی و مونکەراتی وا دەکرا کەبێگومان دەبووە هۆی ناشیرین کردنی

ئیسلامو سڵەماندنەوەی خەڵك لەئیسلام، لەکاتێکدا کە کۆمەڵێکی ئیسلامیی بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی ئامانجە شەرعیی‌یەکەی ئەوەیە خەڵك بەرەو خوا بێنێ و بەرەو ئیسلام بێنێ، بەڵام کە بەشێوەیەك بێت خەڵك لەئیسلام دوور بخاتەوەو خەڵك بسەڵمێنێتەوە دیارە هەر نەبێ باشترە، ئنجا زنجیرە هەوڵ و تەقەللایەکی زۆریشمان دا بۆ ڕاستکردنەوەو چاکسازیی بەڵام هەمووی بە بنبەست گەیشت، پاشان سوپاس بۆ خوا ئێمە کە (کۆمەڵی ئیسلامیی)مان بنیات ناوە، گۆڕانکاری‌یەکی ڕیشەیی و ئیجابی‌مان لەگەڵێك شتدا کردوە، بۆ وێنە:
لەڕووی بەرنامەی کارەوە ئێمە پێشتر بەرنامەمان هەبوو بەتیۆریی (نظري) بەڵام پابەندیی پێوە نەدەکرا بەتایبەتی لەئاستی هەرە باڵادا پابەندی بەبەرنامەوە نەدەکرا، بێگومان هیچ کۆمەڵ و کارێکی ئیسلامییش بەبێ بەرنامە (منهج)یەکی ڕاست و ڕێك و پابەندیی پێوە کراو، هیچ ئامانجێکی شەرعی‌ی بۆ ناهێندرێتە دی.
پاشان لەڕووی چۆنێتی قیادەوە، بەڵێ ئێمە ئەوکاتی بەشێوەیەکی ڕواڵەتی قیادەمان هەبوو، بەڵام لەڕاستی‌دا ئەو قیادەیە هەر بەناو قیادە بوو، ئەگەرنا وەك پێویست ئەمرو نەهی نەدەڕۆیشت بەسەر قاعیدەکە‌ی‌دا، قاعیدە متمانەی نەبوو بەقیادەی و بیستن و فەرمانبەریی (سمع وطاعة)ی بۆی نەبوو، بۆچی؟ چونکە قیادە بەشێوەیەك ڕەفتاری نەدەکرد کەقسەی بەسەر قاعیدەکەیەوە بڕوات و قاعیدەکەی ناچار ببکات و پابەند (مُلزِم) بکات لەقسەی دەرنەچێت و بیستن و فەرمانبەریی بۆی هەبێت، چونکە کە قیادە خۆی پابەند نەدەبوو بە بەرنامەو بەبڕیاری شووڕاوە دیارە قاعیدەکەیشی بیانوو و پاساوی ئەوەی دەبوو کە بەقسەی نەکات.
وە لەڕووی ڕاوێژ (شورى) و کار ڕاپەڕاندن لەسەر بناغەی ڕاوێژو پرس و ڕا بە یەکتر کردنەوە، سوپاس بۆ خوا ئێمە وەك لەو (٢٥) خاڵەدا بەناوی (بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتی‌یەکانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی ڕەسەن) باسمان کردوە یەکێك لەخاڵەکان ئەوەیە کەشووڕا پابەندکەر (مُلزِم)ە لەهەموو

ئاستەکاندا، ئێمە تائێستا لەوەتەی (کۆمەڵی ئیسلامیی) ئیعلان کراوە پابەندین بەو ئەسڵەوەو لێمان لانەداوە وە خوا پشتیوان بێ لێشی لانادەین.

ئنجا بەتەئکید پێشتر جیاوازیی (انفصال) و لێك ترازانێکی زۆر هەبوو لەنێوانی قیادەو قاعیدەدا، قیادە لەقاعیدە ڕازی نەبوو، قاعیدە متمانەی بەقیادەی خۆی نەبوو، پرتەو بۆڵە هەبوو لەنێوانداو نازو گلەیی زۆر هەبوو؛ بەڵام سوپاس بۆ خوا ئێستا پێکەوەجۆشدران (انسجام) و خۆشەویستیو ئولفەتی زۆر وە ڕێز لەیەکتر گرتنی دووسەرە، وە ڕاوێژ بەیەکتر کردن هەیە، لەقیادەوە مشوور خواردن هەیە بۆ قاعیدەو بەتەنگو بەخەمەوەبوون هەیە، پرسو ڕاوێژ پێکردن هەیە، وەگوێ بۆ گرتنو پێشنیار لێ وەرگرتن هەیە، وە لەقاعیدەشەوە گوێ بۆ گرتنو پابەندیی (سمع وطاعة) هەیە بۆ قیادە.

وە لەڕووی دارایی (مالیة)یەوە کاتی خۆی کەمو زۆر دەمانزانی (بیت المال) چەندی داهات هەیەو چەندی دێتە نێو، بەڵام نەمان دەزانی چی لێ دێت! بەڵکو زۆرجاریش نەدەزاندرا چەندیش دێت!، بەڵام ئێستا ئەگەر دۆلارێك یان دینارێك بێت، ئەوە ئەو کەسە کەناردوویەتی بەنامەی ڕەسمی ئاگادار دەکرێتەوە کەئەو ئەندازەیەی ناردت پێمان گەیشت، بۆ هەرکەسێك کەدەستکەوتێکی بێت ئێمە وەکو بنچینەیەك دامانناوە کەدەبێ بگەیەندرێ بەشوێنی خۆی کەدارایی گشتییە.

پاشان لەڕووی پابەندیمان بە پرەنسیپەکان (مبادئ)ی خۆمانەوە بەو (ثوابت)ە شەرعییانەی کە (کۆمەڵی ئیسلامیی) لەسەریان دەڕوات، ئێمە تووشی گەلێك فشارو گوشارو زەختی ئەملاو ئەولا بووین، بەڵام سوپاس بۆ خوا پاش تەوفیقو هیدایەتی خوا، هەوڵو هیممەتی قیادەو قاعیدەو دەستبار بۆ یەکتر گرتنمان وایکرد کە بتوانین پابەند بین بە (مبادیء)ی خۆمانەوە وە داکۆکیو جەخت بکەین لەسەر ئەو (ثوابت)ە شەرعییانەی کەبوونی خۆمان لەواندا دەبینین.

هەروەها لەڕووی واقیع بینییەوە جیاوازیی زۆر هەیە، چونکە بۆ وێنە کاتی خۆی ڕەنگە زۆرجار شەڕێك کرابێ بەبێ ئەوەی کەبەرنامەی بۆ داندرابێ و بەبێ ئەوەی کەهێزی خۆت و تەرەفی بەرانبەر حیسابێکی وردو واقیع بینانەی بۆ کرا بێت، بەڵام ئێستا لەخوا بەزیاد بێت لەسەر بنچینەی واقیع بینی و خۆناسین و بەرانبەر ناسین و هەل ومەرج ناسین، وەچی پێویستەو گرنگە ئەوە کردن و ئەنجامدان بۆ ئیسلام وە بۆ کاری ئیسلامیی، لەسەر ئەو بنچینەیە بەڕێوە دەچین و کاری خۆمان بەڕێوە دەبەین.

وەگەلێك شتی‌تر کە ئەنجام دراوە وەخوا پشتیوان بێت گەلێك ئامانجی دیکەو گەلێك بنەماو ئەسڵ و بنچینەی دیکە، کەخوا پشتیوان بێت لەداهاتوودا پابەندی‌یان پێوە دەکرێت وە (انشاءالله) دەدرەوشێندرێنەوە لە (کۆمەڵی ئیسلامیی)دا.

٢-یەکی دیکە لەو گلەیی و گازندەو ڕەخنانەی کەهەیە ئەوەیە کەدەڵێن: خۆ (کۆمەڵی ئیسلامیی)یش کۆمەڵێك کەم وکوڕیی هەن و فلان شتە بۆچی وایە؟ یان فلان شتەیش نەچۆتە جێگەی خۆی و سەیرکەن فلان ڕەفتارو فلان شتەیش هەروەك هی سەردەمی (بزووتنەوە)یە... هتد!!

**جا لەوەلامی ئەوجۆرە گلەیی و گازندەو سەرنج دانە ڕەشبینانەیەشدا دەڵێین:**

هیچ کاتێك ئێمە ئیدیعای ئەوەمان نەکردوە کە لەهەموو ئاوان پەرپووینەوەو بەرەی خۆمان لەناو دەرهێناوەو لەهەموو خەمێك ڕەخسیوین، بەڵکو دان بەکەم وکوڕیی دادێنین وە بەڕاستیش کردەوەی ئینسان لەکەم وکوڕیی خاڵی نابێت؛ وەك پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی: **(كل بني آدم خطـاءٌ وخير الخطـائين التوابون)** رواه احمد وأبوداود.

بەڵام ئەو کەم وکوڕی‌یانەی کەفززە لەئیشی ئیسلامیی دەبڕن و وای لێدەکەن کە لەنیوەڕۆك (محتوى)ی خۆی خاڵی بکەنەوە کەنەبوونی بەرنامە (منهج)ێکە، نەبوونی قیادەیەکی سەر ڕاست (رشيد)ە، نەبوونی شووراپە، نەبوونی دەست پاکی‌یە، نەبوونی بەردەوامی پابەندی‌یە بە (ثوابت)ی

شەرعی‌یەوە، وە نەبوونی واقیع بینی‌یە، سوپاس بۆ خوا کە ئەوانەمان چارەسەر کردوەو بەردەوامیشین لەسەر زیاتر قووڵ کردنەوەی ئەوانە، وە چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی دیکەش کەهەن.

ئنجا لەڕاستیدا هەبوونی کەموکوڕیی دەبێ هاندەری زیاتر کارکردن‌و جیددیەتی زیاترو باشتر بێت نەك بیانووو پاساوی هەڵخزان‌و پشت کردنەوەو پاڵدانەوەو وازهێنان!، بەڵێ ئێمە دەڵێین، بەتەئکید کەموکوڕیمان هەیە بەڵام هەرکەسێك کە کەموکوڕی‌یەکان دەبینێ با بێت لەگەڵماندا چاك بکات، ئەگەرنا ئەو ڕەخنە گرتنەی ئەو کەئامادە نی‌یە کەموکوڕی‌یەکانمان لەگەڵ چاك بکات یەکێکە لەعەیبەکان، ڕەخنە گرتنێك کەتەنیا قسە بێت واتە: (وەستای قسان‌و کۆڵەواری دەستان) بێ بۆ خۆی یەکێکە لەعەیبەکان‌و یەکێکە لەکەموکوڕی‌یەکانمان، کە بێین هەر عەیبەکانی خۆمان بژمێرین بەڵام قۆڵ هەڵ نەکەین لەچاك کردنی عەیبەکان، ئێمە دەڵێین: عەیب‌و کەموکوڕی هەیە بەڵام ئەوە نین کەبەشێوەیەك بن چارەسەر نەکرێن، ئەو شتانەی کەسەرەکی‌و بنەڕەتین ئێمە کاری زۆرمان کردوە کەچارەسەریان بکەین، وە (انشاالله) زیاتریش کاریان لەسەر دەکەین، هەندێك شتی دیکەش ماوە کەبەڕاستی چارەسەرو گۆڕینیان پێویستی بەپلە پلەیی (تدرج) هەیەو پێویستی بە زەمەن‌و کات هەیە، ئەوانەی کەشارەزای دەروون ناسیی‌و کۆمەڵ ناسیی هەن، دەزانن کەگۆڕانکاریی‌و گۆڕان بەسەر نەفسی ئینسان‌و عەقڵی ئنیسان‌و تەبیعەتی ئینساندا هێنان پێویستی بەکات‌و بە صەبرگرتن دەکات، خوای پەروەردگار لەو هەموو ئایەتانەدا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: صەبر بگرە (واصبر)، چاوەڕێ بە (فانتظر)، پەلە مەکە (ولا تستعجل لهم) بەڵام هەڵبەتە لەگەڵ کارکردندا.

٣-وە لەو بارەشەوە کەشت بەئێمە دەگوترێ‌و، هەندێك پڕوپاگەندەو زمان لێکوتان‌و چەواشەکاریی‌مان بەرانبەر دەکرێ، وەك (کۆمەڵی ئیسلامیی)، بەکورتی دەڵێین:-

بێگومان ئەگەر بێت و ئێمە بمانەوێ وەڵامی هەموو ئەو شتانە بدەینەوە کە دەرحەق بەئێمە دەگوترێن و دەکرێن، وەختێکی زۆری خۆمان بەهەدەر دەدەین، لەبەرئەوە ئێمە هەر لەسەرەتای ئیعلانکردنی (کۆمەڵی ئیسلامیی)یەوە لەسەر خۆمان و لەسەر برایانی خۆمانمان کردە مەرج کەدەبێ خۆمان بپارێزین و خۆمان کۆنترۆڵ و مەرزەم بکەین، کەسێك [٥] کە دەستدرێژیمان دەکاتە سەر مەگەر زۆر لەسنووری بەرێتە دەرو بە ترسنۆکمان لێ حاڵی بێت و بەناچاری وەڵامێکی بدەینەوە تاکو حاڵی بکەین کە نەیناسیوین، ئەگەرنا نابێ وەڵام بدەینەوە، وەکەسێك کە زمان درێژیمان دەکاتە سەرو وتارمان لەسەر دەدات و بەیانمان لەسەر دەردەکات و نامیلکەمان لەسەر دەنووسێت، ئێمە نابێ وەڵام بدەینەوە، بۆ؟ چونکە دیارە شەیتان زەفەری بەو بردوەو لەخشتەی بردوە ئەگەرنا دنیا پڕە لەکافرو مونافیق بۆ دەبێ خەریکی چوار برای مسوڵمانی خۆی بێت سەر ئێشەیان بۆ دروست بکات و پڕوپاگەندەو درۆو دەلەسەیان بەدوادا بکات و بوختانیان بۆ هەڵبەستێ، یان لەپشت پەردەی ڕەشەوە تەماشایان بکات، یان تەنانەت ئەگەر عەیبیشیان هەبێ عەیبەکانیان بژمێرێت؟!! ئایا خەڵکی عەیبدارتر زۆر نییە؟! یان ئایا ئەگەر ئەو برا مسوڵمانە خەریکی عەیبەکانی خۆی بێت باشتر نییە؟! وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (طوبى لِمَنْ شَغَلَهُ عَيْبُهُ عَنْ عيُوب الناس).

ئنجا کەئەو برا مسوڵمانە سەرگەردانەمان شەیتان زەفەری پێبردوەو بە بوغزو کینەو دژایەتی و ئازاردانی ئێمەیەوە خەریك کردوە، دەبا ئێمەیش وریا بین و شەیتان زەفەرمان پێنەبات و بەئەوەوە خەریکمان نەکات. با ئێمە سەرگەرمی کاربین، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:(وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ) (التوبة:١٠٥)

بەڵێ با ئێمە کار بکەین و گوێ بەئازار نەدەین جا ئێمە ئەوەی گوتم لەسەر

---

[٥] دیارە مەبەستمان کەسێکی مسوڵمان و نێو ئەهلی ئیسلامە.

خۆمانمان كردۆته مەرج و بڕیارمان داوە، سوپاس بۆ خوا تائێستاش هەر پابەندیی (إلتزام)مان بەو بەڵێنەوە كردوەو خوا یاربێ بەردەوامیش دەبین.

بەڵێ ئێمە زۆرجاران دەستدرێژیی‌مان كرایە سەر، كەمین و بۆسەمان بۆ دانرا، خەڵكێك پیلان و فێڵ و نەخشەی خەراپی بۆ داڕشتین، بەئەهلی كوفر هەڕەشەمان لێكرا، بەیانمان لەسەر دەركرا، وتارمان لەسەردراو نامیلكەیان لەسەر دەركردین، پڕوپاگەندەی زۆریان بۆ كردین، بەلام هەمیشە هەوڵمان داوە كەخۆمان مەرزەم بكەین، وە برایانیشمان بەهەمان شێوە، كە بەڕاستی من زۆر سوپاسی هەموو برایانی موجاهیدو خوشكان و ئەندامان و دۆست و لایەنگرانمان دەكەم كە پابەندیی‌یان هەبوو بە بڕیارو بەفەرمانی سەرووی خۆیانەوە، وە لەگەڵ ئەو خەڵكانە نەچوونە تەرازووەوە كەبەدەست و زمان و كردەوە دژایەتی ئێمەیان كرد، بەڕاستی من زۆر سوپاسیان دەكەم وەك لەگەلێك وتارو بۆنەدا سوپاسمان كردوون.

وە بۆ ئەوانەش كەبرای مسوڵمانی خۆمانن و بەخراپە باسمان دەكەن و پڕوپاگەندەمان لەدژ دەكەن و گەلێك جار درۆو بوختانمان بۆ هەڵدەبەستن، ئێمە لەخوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە كەشیفایان بدات و ئیصلاحی حاڵیان بكات، خوای پەروەردگار وایان لێبكات كەعەیبەكانی خۆیان ببینن و خەریكی چاككردنی عەیبەكانی خۆیان بن وە ئێمەو ئەوان و هەموومان خەریكی ئەوە بین كەئەو میللەت و وڵاتەی خۆمان بەنووری ئیمان و ئیسلام هیدایەت بدەین و ئاوەدان بكەینەوەو، خەریكی وردە شەڕو وردە گرفت و كێشەی لابەلا نەبین و، خەریكی هۆنینەوەی عەیبی یەكتر نەبین، بەڵكو خەریكی ئەوە بین كەچۆن ئەو خەڵك و میللەت و وڵاتەی خۆمان بهێنینە ژێر چەترو سێبەری ئیسلام و ژێر سایەی شەریعەتی خوای پەروەردگار، وە پاشان ئەو واقیعە ئیسلامی‌یەی كە لەكوردستاندایە - وە خوا پشتیوان بێت دەبێت بەكیان و قەوارەیەك - فراوانتریشی بكەین كەشوێنانی‌تریش بگرێتەوە خەڵكی تریش و مسوڵمانانی تریش لێی بەهرەمەند بن، باخەریكی ئەوە بین.

بەڵێ بائێمە بۆ ئەو ئامانجە گەورانە هەوڵ بدەین و ئاوا تەماشای ئەو ئاسۆ دوورانە بکەین، نەك (پێ)مان لەبەر (پێ) بئالقێ و خەریکی سەرئێشاندنی یەکتر بین! کە بە تەئکید تەنیا شەیتان و شوێنکەوتوانی بەوجۆرە ڕەفتارە خۆشحاڵ دەبن و هەر دوژمنانی ئیسلام کەڵکی لێ وەردەگرن، وە ئەوەی زەرەرو زیانی لێدەکات تەنیا ئەهلی ئیسلامە.

جا وەك لەسەرەتاوە لەسەرخۆمانمان بەمەرج گرتوەو کردوومانە بە بەڵێن و پەیمان کە نەچینە ئەو جۆرە مەیدانانەوەو نەچینە نێو بازاڕی ئەو جۆرە ڕەفتارە سووکەڵانەوە، (انشاءالله) لەوەو پاشیش هەر پابەند دەبین، وە دوعای شیفاش بۆ ئەو برایانە دەکەین، وە خوا پشتیوان بێت ڕۆژێکیش دێت کەهەموو تواناو وزە (طاقة)کان نەك هەر لەئاستی کوردستاندا بەڵکو لەسەر ئاستی عێراق و لەسەر ئاستی وڵاتانی ناوچەکەو لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلام و ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ هەموو تواناو وزەی مسوڵمانان بەرەو تەحقیقی ئامانجە شەرعی یە گەورەو باڵایەکان کەبریتی یە لە سیادەت و باڵادەستی شەریعەتی خوای پەروەردگارو بریتیە لە چەسپاندنی عەدالەتی شەریعەتی خوای پەروەردگار وە سەرەنجام سەرفرازو بەختەوەرکردنی هەموو مرۆڤایەتی، خوا پشتیوان بێ هەموو تواناو وزەکان بەرەو ئەو ئامانجانە ئاڕاستە دەکرێن، وە خوای پەروەردگاریش عاقیبەت و سەرەنجامی هەموو لایەکمان خێر بکات.

ئێوەیش براو خوشکانی مسوڵمانمان لەهەندەران، لەو وڵاتانە کە وڵاتانی ئەهلی کوفرن، وەسیستەم و حوکمەکانی ئەهلی کوفر بەسەریاندا حاکمن، بۆتان لەخوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە کە تەوفیقتان بدات خۆڕاگر بن و دامەزراوو نەلەخشاو بن و ئیمان و دینەکەتان بەهیچ شتێك نەگۆڕنەوە، ڕەوشت و ئاکاری بەرزی خۆتان و خێزان و دەرو دراوسێ و خزم و دۆستانتان بپارێزن، وە ئەوەندەی کەلەوێ لەو وڵاتانە دەژین و دەمێننەوە و پێویست

دەکات لەوێ بمێننەوە، بەشێوەیەک بژینو بەشێوەیەک بمێننەوە کە ڕەزامەندیی خوا وەدەست بێنن، وە بەدەستکەوتی باشیشەوە لەڕووی ماددیو مەعنەوییەوە بگەڕێنەوە، تا (انشاءلله) بەختەوەریی دنیاو دوا ڕۆژ بۆ خۆتان مسۆگەر بکەن.

وە لەکۆتایی قسەو ئامۆژگاییەکانم دا دەڵێم: هەموو لایەکتان بەو خوایە دەسپێرم کەهەر شتێك پێی بسپێردرێ زایەی ناکات

وصلى الله على محمد وعلى اله وصحبه اجمعين

وآخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمين

١٧/جمادى الاولى ١٤٢٣

دوا پاکنووسو پێداچوونەوەی

٢٠٠٢/٧/٢٧ تاران / هوتێل (بزرگ تهران).

# ناوەڕۆك

بسم الله الرحمن الرحيم

يَا أيها الذينَ آمنوا أتقوا اللّٰهَ وَلتنظر نَفس مَا قَدمَت لِغَدٍ وَاتقوا اللّٰهَ إن اللّٰهَ خبير بِمَا تَعمَلونَ * وَلا تَكونوا كالذينَ نَسوا اللّٰهَ فأنسَاهم أنفسَهم أولئك هم الفاسِقونَ *

(الحشر: ١٨-١٩)

ژمارەی سپاردنی (٤٦٣)ی ساڵی ٢٠٠٢ی وەزارەتی رۆشنبیری دراوەتێ